"بانگی کوردستان

"صاحیبی ئیمتیازی بانگی کوردستان سەعادەتمەئاب جەنابی مستەفا پاشا هەر بەو ناوەوە بۆ دەرهێنانی غەزەتەیەکی سیاسی روخصەتی ئیستیحصال کردوە. ئەم رەفیقە تازە و خۆشەویستەمان تەبریک و رەواجی تەمەنا ئەکەین."ژیان، ژ ٤، ١٤ ی شوباتی ۱۹۲۶

"دیاری کوردستان

"نوسخەی شانزدەمینی مەجەلەی دیاری کوردستان هاتوە، پڕ لە مەقالات و خەبەراتی بە ئەهمیەت و بە کەڵکە. مەقصەدی خزمەتکردنی وەتەن و مەنافیعی میلەتی کوردە. بە خوێندنەوە و ئیشتیراکی ئەم مەجموعە بە قیمەتە تەوصیەی قارئینی کیرام ئەکەین."ژیان، ژ ۲۱، ١٧ ی حوزەیرانی ۱۹۲۶

"زاری کرمانجی

"ئەوەل نوسخەی مەجموعەی زاری کرمانجی کە لە تەرەف صاحیبی ئیمتاز و مدیری مەسئولی جەنابی سەید حسێن ئەفەندی موکریانی‌یەوە لە رەواندز دەر ئەهێنرێ بە ئیدارەخانەمان گەیشت. جدەن مەسرور و خۆشحاڵ بوین کە مەجموعەیەکی تری وا بە قیمەت بە کوردی ببینین. ئەمە هیمەت و غیرەتێکی زۆر گەورەیە و نیشانەی سەعادەت و تەرەقی قەومی نەجیبی کوردە. خصوصەن هێنانە وجودی مەتبعەیەک لە رەواندز مەحصولی حسێکی بەرز و فەعالیەتێکی زۆر گەورەیە. بە دڵ و بە گیان تەقدیری ئەم هیمەتە و نەلەبی موەفەقیەت و رەواجی ئەم رەفیقە بە قیمەتەمان ئەکەین."ژیان، ژ ۲۲، ۱ ی تەموزی ۱۹۲۶

"ڕۆژنامەی زاری کرمانجی کە بەینێک لەمەوپێشەوە لە بەر بەعزێ نوقصانیەت ئینتیشاری نەئەکرد بە واسیتەی موعاوەنەتی قیسمێک حەمیەتمەندانەوە دەستی کردۆتەوە بە ئینتیشار تەمەنای دەوامی ئەکەین."(ژیان، ژ ١٣٩، ٢١، کانونی سانی ١٩٢٦)

"داخلی:

"مدیر و موحەڕیری مەجەلەی زاری کرمانجی موحتەرەم سەید حسێن حوزنی ئەفەندی بۆ پێکهێنانی ئیشوکاری مەجەلەکەی و بلاوکردنەوەی کتێبێک کە بەمزوانە بە ناوی (ئاوڕێکی پاشەوە) تەئلیفی کردوە تەشریفی هێناوەتە سلێمانی عەرزی بە خێرهاتنی دەکەین."(ژیان، ژ ٢٥٨، ٢٨ ی ئاغستۆسی ١٩٣٠)

کەرکوک

"ژیان برایەکی خۆشەویست و پشتیوانێکی بە قوەتی چنگ کەوت

"چەند ڕۆژێک لەمەوپێش بە سرورەوە بیستمان غەزەتەی کەرکوک کە ڕەفیقێکی خۆشەویستی ژیانە بە سەبەبی ئەوەوە لە کوردستان و لە ناو میلەتی کوردا ئینتیشار ئەکات بۆ ئەوەی ببێ بە ئاوێنەی حاڵ و تەرجومانی حەقیقەتی میلەتەکە ئیتر لەمەودوا قیسمێکی زۆری بە کوردی ئەنوسرێ و ئینتیشار ئەکات. ئەم خەبەرە بە جدی سرور و خۆشیەکی تەواوی خستە دڵی میلەتەکەمانەوە و هەمو کوردێک بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ڕاستی ئەم خەبەرە خۆشە و بە عەجەلە ئینتیزاری چاوپێکەوتنی ئەو غەزەتە کوردیەی ئەکرد. شوکور دوێنێ لە ناکاودا خەبەرەکە تەحەقوقی کرد و غەزەتەکە کە دو صەحیفەی بە کوردی نوسرا بو هاتە سلێمانی و بە داخل بونی حەیاتێکی تازەی خستە وجودی میلەتەکەمانەوە و بەم سەبەبەوە (ژیان) یش برایەکی عەزیز و پشتیوانێکی بە قوەتی بۆ پەیدا بو.

"خوێندەوارەکانمان تاقم تاقم بۆ چاوپێکەوتن و خوێندنەوەی ئەم غەزەتە بە قیمەتە موحتەرەمە شەتابیان ئەکرد و حەقیقەتەن ئەم مەسئەلەیە ئەمەندە خۆش بو کە لە موقابیلیا ناتوانین بە تەواوی دەرەجەی سروری میلەتەکەمان بەیان و تەعریف بکەین چونکە ئەم دو لیوایە کە دراوسێی یەکترین و ئەهالی‌یەکەی هاوخوێن، هەم جنس، هاوزبان و هەمو غایەیەکیان یەکە بە سەبەبی ئەوەوە غەزەتی کەرکوک هەتا ئێستا بە لیسانی محەلی و مادەرزادی خۆی ئینتیشاری نەئەکرد، لە هاواری یی‌کتری نەئەگەیشتن و بە فریادی یەکتری نەئەکەوتن بەڵام وا شوکور بە سەبەبی لوتفی حکومەت و مەئمورینە ئیداریە بە قیمەتەکانمانەوە ئەم مانیعەیە هەڵ گیرا و ئەم پەردەیەی بە سەرمانا راکێشرا بو لابرا و لە یەکتری ئاشکرا و مەعلوم بوین.

"بەرامبەر بەم حەرەکەتە مەعقولە، ئەم مژدە خۆشە و ئەم لوتفە گورەیە، عەلەنەن بە ناوی میلەتەکەمانەوە تەشەکوری حکومەتی موشفیقە و حەقپەرستمان ئەکەین. ئومێد ئەکەین ئیتر ئەم ٣ برا عەزیزە کە: زاری کرمانجی، کەرکوک و ژیانە، دەست بدەن دەست و پشتیوانی یەکتری بن و بە هەمو قوەتیانەوە بۆ تەرەقی و تەعالی موڵک و میلەتەکە هەوڵ بدەن و تێ کۆشن." (ژیان، ژ ٢٣٨، ٨ ی مایسی ١٩٣٠)

"غەزەتەی کوردیی کەرکوک

"دیسانەوە بە خۆشیەوە خوێندمانەوە غەزەتەی کەرکوک کە هەتا ئێستا دو صەحیفەی بە کوردی دەرئەچو قەرار دراوە هەمو رۆژێکی دوشەمە دەرچێ و چوار سەحیفەی بە کوردی بێ. بەرامبەر بەم مژدە خۆشە میلەتەکەمان پێخۆشحاڵ بو، ئومێد ئەکەین ئەم برا خۆشەویستەمان هەتا سەر بە موەفەقی خدمەتی وەتەن و میلەتەکەمان بکات." (ژیان، ژ ٢٤٠، ٢٢ ی مایسی ١٩٣٠)

هاوار

"دیاری دیار بۆ کۆواری هاوار

هاواری کوردان لە شامەوە هات

هەواریان بەرز بێ دور بن لە نەهات

شام سەحەری دێ، سوری سورداره

تا لە شەودا بین بەشمان هاواره"ژیان، ژ ۳۳۰، ١٤ تەموزی ١٩٣٢)

## ٦. ٢. کتێبی مەکتەب

"دەنگوباس

"مژدە!.. لە سەمای مەعاریف دا ئەستێرەیەکی قیمەتدار

"ئەلفبایەکی کوردی کە موافیقی ئوسولی تەدریس و لە سەر تەرزی تازە لە تەرەف ئەحمەد ئەفەندی عەزیز ئاغاوە تەرتیب و تەئلیف کرا بو و مودەتێ لەمەوپێش لە تەرەف ئەنجومەنی مەعاریفی ئێرەوە لە پاش لێ ورد بونەوە بە باش زانرا و، بە واسیتەی لوتفی عالی موتەسەریفی مەعاریفپەروەر و موفەتیشی ئیداری عالی قەدرەوە بۆ چاپ نێررا بوە بەغدا، ئەمجارە لە تەرەف وەزارەتی جەلیلەی مەعاریفیشەوە تەسدیق و تەبع فەرموراوە و، لە مەداریسی کوردیەدا ئەمر بە تەدریسی کراوە.

"ئەمە ئەوەل ئەسەرێکی قیمەتداری کوردیە کە ئەولادی کورد ئەیگرێتە باوەش. ئومێد هەیە بە واسیتەی سهولاتێک کە لەم ئەسەرە قیمەتدارەدا پیشان دراوە ئەولادی کورد بە بێ ئەرک و ئەزیەت لە زەرفی مودەتێکی زۆر کەم دا فێری خوێندن و نوسین ببن. بە هیواین ئەم پۆستەیە نوسخە چاپکراوەکانی بێتە سلێمانی. فرسەتە وەریگرن و ئیستیفادەی منالتانی پێ تەئمین بکەن. اسعد شوکر سمایلنامە و بیا داود نەما...)

"ژیان بەرامبەر بەم هیمەتە و لوتفە گەورەیە خۆی بە مەدیونی شوکران ئەزانێ."ژیان، ژ ٤٩، ٦ ی کانونی سانی ١٩٢٧)

لە کۆتایی بیستەکان و سەرەتای سییەکانی سەدەی بیستەم دا هەندێ کتێبی خوێندنگە سەرەتاییەکان کراون بە کوردی. وەکو هەنگاوی یەکەم دیارە کەموکورِی زۆریان تێ دا بوە. ع. عەزیز کە خۆی مامۆستای خوێندنگەی سەرەتایی و یەکێ بوە لەوانەی بەشداری تەرجومەی کتێبەکانی کردوە، وتارێکی بە چەند ئەڵقەیەک لە ژێر ناوی (مەتبوعاتمان) دا بلاو کردۆتەوە، نوسیوێتی:

"دەرەجەی عیلم و ئیدراکی میلەتێک و نەوعی پێشکەوتنیان لە مەتبوعاتیان دەرئەکەوێ چونکە میلەتێکی دواکەوتو کە وریا بووەوە پێش هەمو شتێک هەوڵ ئەدا بۆ تەرەقی مەعاریف، کە بناغەی مەعاریفیش مەتبوعاتە وە یا بناغەی مەتبوعات مەعاریفە، لە دوایی‌دا ئیقتیساد و، لە پێش هەمویان دا ئینجا عەمارەت و سیاسەت و سائیرە، چونکە میلەتێکی جاهیل لە روی نەزانینەوە گەلێ شت بە چاک ئەزانێ و ئەیکا نەتیجە زەرەر و زایع بونی حقوقی خۆی ئینتاج ئەکا. بۆ پێشکەوتنی مەعاریفیش یەگانە رەهبەر مەتبوعاتە کە ئەمەش ئەنواعی هەیە، مەسەلەن غەزەتە تەرجومانی حسیاتی میلەتە، کتێب و ئەدەبیات ئاوێنەی کەمالیاتی ئەو میلەتەیە و، کوتوبی عیلمی، ئەمەش یا تەئلیف وە یا تەرجومە ئەکرێ لە لوغەتێکی ئەجنەبیەوە، کتێبی مەکتەبیش لە میانەی ئەمانەدا ئەژمێررێ.

"لە زەمانی حکومەتی ئەمەویە و عەباسیەدا کە قەومی عەرەب هەوڵی تەرەقی عیلم و مەعاریفیان دا لە زەمانی هارون ئەلرەشید و مەئمون دا لە زبانی هندی، یۆنانی و فارسی بە هەزاران کتێب تەرجومە کرا بەم جۆرە مەتبوعاتیان (نوسەر لە بە کار هێنانی وشەی مەتبوعات دا لێرەدا بە هەڵە چوە لەو سەردەمەدا مەتبەعە نەبوە تا مەتبوعات هەبێ، کتێبەکان بە دەس نوسراونەتەوە. نما) پێش خست و تەرەقی‌یان کرد. هەروا ژاپۆنیاییەکان،

تورکەکان لە ئیبتیدای وریابونەوەیان دا ئەوەڵ ئیشیان پێش خستنی مەتبوعاتیان بو.

"قەومی کوردیش لەم قەرنی ئەخیرەدا کە وریا بونەوە فەرقی ئەم نوقسانیەتەیان کرد بۆ عەینی غایە لە ئەستەموڵ لە زەمانی حکومەتی عوسمانی مەجموعەی (رۆژی کورد و هەتاوی کورد) یان نەشر کرد و بەعزێ کتێبیان لە چاپ دا و ئیستاش لەم زەمانی حکومەتی عیراقیەش دا هەمو نەوعە موساعەدەیەک کراوە بۆ دەرهێنانی غەزەتەی سیاسی و مەجموعەی عیلمی و کوتوبی مەدرەسی و ئەدەبی و بۆ تەدقیق و لە چاپدانی کتێبی مەکتەبی لە عالم و منەوەرانی کورد لوجنەیەک هەڵبژێرراوە. وە وەزارەتی مەعاریفی عیراق بۆ تەشویق کردنی موعەلیمانی کوردی بۆ تەرجومە کردنی کتێبی مەکتەبی بە هەمو مەکتەبەکانی کوردا تەعمیمێکی بڵاو کردەوە کە ئەمە نەوعەما فرسەتێکی بەخشی بە وانەی ئارەزوی خزمەتی مەعاریفیان هەیە."(ژیان، ژ ٢٣٦، ٢٤ ی نیسانی ١٩٣٠)

لە بەشی دوەمی وتارەکەی دا ع. عەزیز نوسیویتی:

"بەڵام مەعلومی خوێندەوارانی کیرامە کە شەخسێک لە عیلمێک نەزانێ وە یا لە لوغەتێک تێ نەگا ناتوانێ لە تەرجومەی ئەو عیلمەدا موەفەق بێ. هەروەکو وتمان لە سایەی تەشویقی مەعاریف و بە سەعی کۆمەڵی تەئلیف و تەرجومە لەم نزیکانەدا چەند کتێبێکی کوردی تەرجومە و لە چاپ درا. بەڵام مەعەلئەسەف لە ناو ئەم کتێبانەدا بەعزێکیان لە بەر نوقسانیەتی مەتبەعەیی وە یا عیلمی ئەتوانم بڵێم کە قابیلی ئیستیفادە نین بۆ قوتابیەکانمان. خسوسەن لەمساڵی تەدریسیەدا دو کتێبی کوردی لە چاپ درا. یەکێکیان هەندەسەی صنفی چوارەم و ئەوی تریان عیلمی ئەشیای صنفی شەشەمە. ئەم دو کتێبەم زۆر بە دیقەت خوێندەوە. هەندەسەکە تەقریبەن

باشە و ئیستیفادەی لێ ئەکرێ بەڵام ئەوی تریان کە عیلمی ئەشیایە و بۆ صنفی شەشەم تەرتیب کراوە کە قوتابی ئەم صنفە داخلی ئیمتیحانی موسابەقە ئەبن ئەم کتێبە سەراپا غەڵەتەش کە بە دەستیانەوە ئەبێ مەعلومی خوێندەوارانە کە زیهنی تەلەبە تێک ئەدا و دەرەجەی نەجاحی مەکتەب لە ناو مەکتەبەکانی عیراق دا دوا ئەخات. ئینجا بۆ ئەمەی کە عەڵەتی تەسحیح کراوی مەزکور بە تەبعکراوی بە دەست قوتابیەکانمانەوە بێ ئارەزوم کرد لە ستونی غەزەتەی ژیان دەرجی بکەم و ئومێد ئەکەم کە ئەم حەرەکەتەم بۆ مەکتەب و منداڵەکانمان بە خزمەت عەد بکرێ و حەمل نەکرێتە سەر غەرەز وە یا شەخسیات. مەعلومە میلەتێک پێش ناکەوێ هەتا تەنقید نەکرێ و عەیبی خۆی تەلافی نەکا. بێجگە لەمەیش لە ترسی ئەمەی کە نەوەک لە لایەکی ترەوە دەرکی ئەم غەڵەتە بکرێ با خۆمان لە دەرکی غەڵەتی خۆمان دا تەقەدوم و لە پێش ئەوان دا تەسحیحی بکەین بەڵکو لەمەولا هەرکەسێ کە کتێبێکی تەرجومە کرد ئەسەرێکی وا ئینتیخاب بکا کە لە داخلی ئیختیساسی خۆیدا بێ."(ژیان، ژ ٢٣٧، ٢٨ ی نیسانی ١٩٣٠)

لە چەند ژمارەیەکی تردا هەندێ لە هەڵە و چەوتی‌یەکانی کتێبەکەی باس کردوە.

وەرگێڕی کتێبەکە: ع. واحید هاتۆتە جواب. ع. واحید هەمان ع. و. نوری‌یە کە یەکێ بوە لە نوسەرە باش و پێشکەوتنخوازەکانی کورد. گەلێ بەرهەمی پوخت و جوانی هەیە. ئەگەرچی وەڵامەکەی هەندێ تورەبونی پێوە دیارە بەڵام دەستی خستۆتە سەر هەندێ لە گیروگرفتەکانی رۆشنبیریی کوردی و لە ژێر سەردێڕی (کتێبەکانی مەکتەبەکانمان) دا نوسیویتی:

"لە ژمارەی ٢٣٧ ی رۆژنامەی ژیان دا بە ناوی ع. عەزیزەوە چەند کەلیمەیەکم دی لە بابەت کتێبی ئەشیای سینفی شەشەمەوە کە خۆم تەرجومەم کردوە و زۆر بە ناشیرینم زانی کە بێ جوابی بهێڵمەوە:

١. منیش بێ ئەمەی تەعەرِوزی شەخسیات بکەم بە کوردی ئەڵێم هەرچی کتێبێک کە لە مەکتەبەکانمانا هەیە و بە کوردی لە چاپ دراون هیچیان بۆ ئەوە ناشێن کە پێیان بڵێن (کتێبی مەکتەب) بۆ ئیسپات کردنی ئەم قسەیەم هەمو وەختێک ئامادەم.

٢. بەڵام ئیحتیاج مەجبوری کردوین کە پێیان بڵێین کتێب. چونکە هێشتا گەنجێکمان پێ نەگەیشتوە کە لە ژێر دەستی مامۆستایەکی کوردا حیسی میللی وەرگرتبێ و بە زمانی کوردی فێری خوێندنێکی تەواو بوبێت. لە بەر ئەوەی مەنتیقەکەیشمان بچوکە فرۆشتنی کتێبەکانمان زۆر کەمە و مەعاریفیش لە بەر ئەم سەبەبی ئەخیرە کەم یارییەی ئەو موعەلیمانە ئەدات کە کتێب تەرجومە ئەکەن.

٣. ئەگەر تەرجومەی ئەم کتێبەم خراپ کرد بو بۆچی ئەمین زەکی بەگ قوبوڵی کرد. وە ئەگەر ئەو کوردی نازانێ بۆچی ئەو کتێبانەی تر کە تەدقیقی کردوە بە باش ئەدرێتە قەڵەم. خۆ من بە زۆر و پاڕانەوە کتێبەکەم پێ قبوڵ نەکرد.

من بڵێم چی ملیۆنێک کورد مەتبەعەیەکیان نیە کە چوار کتێبی لێ تەبع بکەن؟

٤. ئەگەر ئەوەندە شارەزا بویت بۆچی کە پێم گوتی تەرجومەی بکە نەتکرد؟

ئیتر حورمەتی زۆر. ع. واحید"(ژیان، ژ ٢٤١، ٢٩ ی مایسی ١٩٣٠)

## ٢.٩. کتێبی گشتی

"تەئلیفات: پێشەوای ئاین

"کتێبێکی دینیه، بۆ تێگەیشتن لە واجیبات و شەریعەتی ئیسلامیە، لە سەر رەوشتی ئیمامی شافیعی بە ئوصولێکی ڕێکوپێک و کوردیەکی پەتی لە تەرەف خێوی زاری کرمانج جەنابی سەید حسێن ئەفەندی موکریانیەوە تەئلیف و تەبع کراوە.

"نوسخەیەکی ئەم ئەسەرە بە نرخە کە لە شەرت و شروتی ئیسلامێتی باس ئەکات و پێمان بەخشراوە بە ئیدارەخانەمان گەیشت. لامان وایە ئەگەر بێت و بۆ قوتابخانەکانی کوردستان بخرێتە پرۆغرامەوە و لە دەرسی دین دا تەدریساتی لە سەر بکرێ ئیستیفادەی مەتلوب تەئمین ئەکات." ژیان، ژ ٥٨، ١٧ ی مارتی ١٩٢٧

"رەوشت و خو

"مەعلوماتی مەدەنیە

"ئەسەرێکی بە کەڵکە، نوسخەیەکی ئەم ئەسەرە بە قیمەتە کە لە تەرەف لاوانی کوردەوە لە سەر پرۆغرامی مەعاریف بۆ مەکاتیبی کورد تەئلیف و تەرجومە کراوە بە ئیدارەخانەمان بەخشرا.

"محتەویاتی، بە ئوسلوب و تەرزی ئیفادەیەکی جوانەوە سەراپا رێی بونە ئینسانێکی حەقیقی نیشان ئەدات و، زۆر بە ئاسانی ئیستیفادەی قوتابیەکانمان تەئمین ئەکات. لە گەڵ ئەمەی کە نوسخەی دوەمی ئەم تەئلیفە لە ژێر چاپ دایە تەبعی گەلێ ئاساری تریشیان بە دەستەوەیە. لە رێی خزمەتی مەعاریف دا ئەم موەفەقیەتە گەورەیەی لاوەکانمان بە دڵ تەقدیر ئەکەین."ژیان، ژ ٧٢، ٥ ی تەموزی ١٩٢٧

"خۆشی و ترشی

"نوسخەیەکی تر لە موئەلەفاتی صاحیبی زاری کرمانجی و وەتەنی حەقیقی جەنابی سەید حسێن ئەفەندی موکریانی کە لە ژێر عینوانی اخۆشی و ترشی) دا نەشری کردوە بە ئیدارەخانەمان گەیشت. حەقیقەتەن تەئلیفێکی بە قیمەت و کتێبێکی بە کەڵکە. تەوصیەی خۆشەویستانی ئاساری کوردی و کوردپەروەرەکانمانی ئەکەین."ژیان، ژ ٧٨، ژ٨ ی ئاغستۆسی ١٩٢٧

"مژدە بۆ کوردەکان: دەستوری کوردی

"لەم رۆژانەدا بە مەسروریەتەوە لە غەزەتەکانی بەغدادا خوێندمانەوە کە قەواعید دەستوری کوردیەکەی جەنابی تۆفیق وەهبی بەگ کە چەند ساڵێکە لە گەڵیا خەریکە جزمی ئەوەلی تەواو و تەبع کراوە.

"ئەم خەبەرە بۆ کوردەکان بەشارەتێکی خۆشە، چونکە هەمو ئەیزانین میلەتی کورد هەرچەند هەتاکو ئیستا زبانی مادەرزادی خۆی کە کوردیە محافەزەی کردوە و دائیمەن گفتوگۆی بەم زبانەی خۆی کردوە. بەڵام لە بەر ئەوەی مودەتێکی زۆر لە تەرەف تورکەکانەوە ئیستیلا کراین و لە سەرێکی تریشەوە لە گەڵ ئێرانیەکانا دراوسێ و تێکەڵاو بوبوین موخابەراتی بەینی خۆمان بەعزەن بە فارسی و بەعزەن بە تورکی بو وە معامەلاتی رەسمی حکومەتی و تەدریساتی مەکاتیبیشمان بە مەجبوری بە تورکی بو.

"وەقتێک کە شەڕی گەورە دوایی هات و ئێمەیش نەجاتمان بو، بە سەبەبی ئەو فکری میلیەتەوە کە دائیمەن لە دەماغمانا نەقشی بەست بو وە بە سەبەبی موساعەدەی حکومەتی فەخیمەی ئینگلیز و عیراقەوە وە بۆ ئەوەی زبانەکەیشمان زیندو بێتەوە موخابەراتی خسوسی بەینی خۆمان و معامەلاتی رەسمی حکومەت و تەدریساتی مەکاتیبمان کرا بە کوردی. بەڵام چونکە بۆ

لیسانەکەمان دەستورێک ڕێک نەخرابو وە ئەو ئەلفبا و دەستورەیش کە لەم سالأنەدا بۆمان ڕێک خرابو ئیبتیدائی بون، زبانەکەمان تەکامولی نەکرد و بە مەجبوری منالەکانمان و کاتبەکانمان هەرکەس بۆ خۆی بە شێوەیەک ئەیخوێند و ئەینوسی بە نەوعێک کە ئەتوانین بڵێین هەتاکو ئیستا لە هەمو کوردستانا مەعلوم نەبوە چ کاتبێک موقتەدیرە و کێ چاکتر ئەنوسێ.

"تەبیعی هەمو عیلم و ئیقتیداری تۆفیق وەهبی بەگمان لا مەعلومە و ئەیزانین ئەم زاتە لە عیلم و عیرفانا مەوقیعێکی مومتازی هەیە.

"ئینجا بە تەبیعی زاتێکی وەها داهی لە نەتیجەی سەعی و کۆششی چەند ساڵێکیا موەفەق بوبێ بە دانان و تەرتیبی دەستورێکی کوردی موحەقەق ئەبێ ئەم دەستورە فەوقەلعادە بێ و ئیتر لە خوێندن و نوسینی کوردیا موشکیلاتێکی نەهێشتبێ. وە غەیری ئەمەیش وەکو بیستومانە ئەم دەستورە لە تەرەف گەلێ موتەخەسیسینی مەعاریف و پیاوە عالمەکانی عیراق و ئینگلیزەوە تەدقیق کراوە و لە تەرەف هەمویانەوە تەقدیر و بە باش زانراوە و حەتا ئەڵێن ئەگەر منالأنی کورد لە سەر ئەم ئوسولە پێیان بخوێنرێ بە سەهلی بە ٤ مانگ فێری خوێندن و نوسین ئەبێ.

"ئینجا لە بەر ئەوە پێویستە هەمو خوێندەوارێکی کورد یەکێک لەم دەستورە بە دەستیەوە بگرێ و لەمەودوا لە نوسین و خوێندن دا تەتبیقاتی لە سەر بکات و تکایش لە ئیش بە دەستانی مەعاریف ئەکەین لە ئەمساڵەوە ئەمر بدەن ئەو ئەلفبایەی کە هەمانە لە سەر ئەم دەستورە تیکرار تەبع بکرێتەوە و لە هەمو مەکاتیبە کوردیەکانا تەدریسات لە سەر ئەم ئوسولە بکرێ."(ژیان، ژ ١٩٧، ١٢ ی ئەیلولی ١٩٢٩)

تۆفیق وەهبی لە ژیانی خۆیدا گەلێ پلە و پایەی ڕەسمیی لە حکومەتی عیراق دا پێ سپێردراوە. ماوەیەک فەرماندەی زانستگەی جەنگی و چەند

جارێک بوە بە وەزیر و بوە بە ئەندام لە مەجلیسی ئەعیان دا، بەڵام ئەوەی ئەمی لە مێژوی کوردا بە زیندویەتی هێشتۆتەوە لێکۆڵینەوە زمانەوانی‌یەکانی بوە، بە تایبەتی ئەم (دەستوری زمانی کوردی) یە، نەک وەزیفە حکومەتیەکانی.

"دیوانی کوردی

"لە تەرەف جەنابی کوردی مەریوانیەوە (دیوانی کوردی) تەبع کراوە نوسخەیەکمان موتالەعە کرد زۆر ئەشعاری شیرین و لەتیفی تیا موندەریجە. قەریبەن میقدارێکی موناسیب دێت بۆ دوکانی وەستا ئەحمەدی خاڵە عەلی خەیات بۆ فرۆشتن هەرکەسێ ئارەزوی تەرەقیاتی عونسوریە و شیرین مەزاقی ئەشعاری کوردیە هەریەکە نوسخەیەک بکڕێ قیمەتی لە گەڵ مەوزوعات و موندەرەجاتی قابیلی تەوازون و تەناسوب نیە چونکە ٤ ئانەیە. حەقیقەتەن ئەم دو زاتە زۆر خادیمی مەعاریفی کوردین تەبریکی حەمیەتی وەتەنیە و مەساعی نەشری ئاساری قەومیەیان ئەکەین."(ژیان، ژ ٢٩٩، ٩ ی تشرینی دوەمی ١٩٣١)

(لاوێکی کوردا مێژوەکەی ئەمین زەکی کە بە ناوی (خولاصەیێکی تاریخی کورد و کوردستان) ەوە بلاو کراوەتەوە بەمجۆرە هەڵسەنگاندوە:

"تاریخی کورد

١. هەمو کوردێکی تێگەیشتو تا ئیستا گرێیەکی گەورە کەوتبوە دڵیەوە، ئەو گرێیەش نەبونی تاریخێکی رێکوپێکی کورد بو. چونکی نەبونی ئەم تاریخە ئەبو بە سەبەبی نەزانینی رابوردوی ئەم میلەتە و ئەم نەزانینە گەلێ زەرەبەی ئەدا لە مەعنەویاتی ئەم قەومە و ئەبو بە سەبەبی کوژاننەوەی ئاساری ئەجداد و ئەم ناتەواویە زۆر جار ئەفرادی ئەم قەومەی شەرمەزار و

تەجرەبەت ئەکرد لە موجادەلەی ئیجتیماعیدا کە واقیع ئەبو لە بەینی کوردێک و بێگانەیەک دا.

حەقیقەتەن عەیبێکی زل و بێ ئەمان بو، چونکی زۆر ناشیرینە بۆ ئەفرادی قەومێک کە نەزانێ ئەجدادی چین و چی بون؟

وە حالەتی ئیجتیماعیە و سیاسیە و عیلیمیە و سەناعیەیان چۆن بوە و چۆن حاکمیەتیان کردوە؟

چۆن کەوتونە دەورەی زیللەت و سەرگەردانی و رەزالەتەوە و ئەو قەومە چ نەوعە عەنعەناتێکی بوە و هەیە؟

٢. بۆ نوسینی تاریخێکی مەوسوقی کورد وەک بیستومە بەعزێ کوردی بە ویجدان و خوێنگەرم هەوڵیان داوە بەڵام زەمان بوە بە مانیعی سەعی‌یان و نەتیجەی رەنجیان بەر هەوا بوە، وە یاکردویەتی وەک بەعزێ موحەریرینی ئەقوامی شەرقی کۆن نەختێ لە رێ لای داوە.

٣. زۆر شوکر لە ناو ئەو زەواتە موحتەرەمانەدا موەفەقیەت بۆ مەعالی ئەمین زەکی بەگ حاسڵ بوە و نائیلی ئەم دەرەجەی شەرەفە بوە. چونکە لە پاش زەحمەتێکی زۆر و لە ٢٥٠ ئاساری جوێ جوێ کە بە ئینگلیزی و ئەڵمانی و فرانسزی و عەرەبی و تورکی و فارسی بو، ئەسەرێکی مودهیش و موکەمەلی بۆ میلەتی کورد هێنایە وجود و بە پێی مەعلوماتێ کە لەو ئاسارانەی لە سەرەوە عەرزمان کرد ئیسپاتی کرد و دۆزیەوە کە کورد لە نەتەوەی قەومی (گوتی) ئاریە، کە تەقریبەن لە ٢٨ ەمین عەسری پێش میلادا لەم جێگەیەدا حاکم و حوکمڕان بوە و ساحیبی شەوکەت و شەخسیەتێکی بەرز بوە.

وا شوکر چاپی جلدی یەکەمینی بە دو جزم تەواو کرد و زۆر بە مونتەزەمی بلاوی کردۆتەوە کە هەتا ئیستا هیچ کتێبێکی کوردی وا جوان رێک نەخراوە.

٤. بێجگە لەو مەعلوماتەی کە وەری گرتوە بە گەلێ حەقایقی سابیتە و مادی عولەمای ئەقوامی بێگانەی بە سورەتێکی دانایانە و بە حیس و شعورێکی بەرزەوە رەد کردوّتەوە کە جدەن شایانی ئیفتیخار و سرورە. چونکە گەلێ عولەما بۆ کەمکردنەوەی قەومی کورد و بۆ تەشویشی ئەسل و فەسلی کورد گەلێ خورافاتیان داخلی ئاساری خۆیان کردوە. زۆر شوکر باوکی تاریخی کورد مەعالی ئەمین زەکی بەگ رەنجی بە زایە دان و حەقیقەتی زۆر چاک دەرخست.

٥. چونکی تاریخ خالقی شعوری میللی و موەحیدی هەمو شعورێکی قەومیە ئەمینم بەم ئەسەرە نازدارە میلەتی کورد ئاورێکی باش و بە دیقەت ئەداتەوە بۆ مازی و تۆزێ عیبرەتگیر ئەبێ و بە ئیرادەیەکی مەتین و لە سەر خۆ ئیستیقبالێکی روناک بۆ خۆی تەئمین ئەکا.

"لە پێش ئەمەدا واز بێنم لە قسە کردن ئیمانم هەیە بە تێگەیشتوان زو ئەم کتێبە عەزیزە دائەنێن لە کتێبخانەکانیان دا، وە موئەلیفی خۆشەویستی موحتەرەم جلدی دوەم بە زویی لە چاپ ئەدا چونکە زۆر زۆر موحتاجی تەنویرین.

"ئیتر خوا دڵسۆزانی میلەتی کورد مەسعود بکا. لاوێکی کورد"ژیان، ژ ٣٠٢، ٣٠ ی تشرینی دوەمی ١٩٣١)

ئەمین زەکی بەگ لە ژیانی خۆیدا گەلێ پلە و پایەی بەرزی لە حکومەتی تورکیا و لە حکومەتی عیراق دا پێ سپێردراوە. لە عیراق چەند جارێ بوّتە مەبعوس و چەند جارێ بوّتە وەزیر، بەڵام ئەوەی ئەمین زەکی بردوّتە ریزی پیاوە نەمرەکانی مێژوی کوردەوە ئەم پلە و پایە رەسمی‌یانە نەبوە، بەڵکو نوسینی ئەم مێژوە و کتێبە مێژوییەکانی تری بوە.

### ٧ تەمسیل

ژیان لە (هەواڵی ناوشار) دا بە ناونیشانی (تەمسیل) نوسیویّتی:

"لە تەرەف تەلەبەکانی مەکتەبەوە بۆ مەنفەعەتی کەشافە شەوی سێشەموی رابوردو لە بینای مەکتەب دا لە ژێر عینوانی (نەتیجەی سەفاهەت) دا ریوایەیەک تەمسیل کرا. لە گەڵ ئەمەی کە ئەوەلەمین جاریان بو حەقیقەتەن زۆر جوان تەمسیل کرا. مەزهەری تەقدیر و تەحسینی هەمو لایەک بو. بژی موحیبانی عیلم و ئەدەب."(ژیان، ژ ٢٦، ٢٩ ی تەموزی ١٩٢٦)

رەنگە ئەوە یەکەم جار بوبێ کە لە سلێمانیدا شانۆنامەیەک پێشکەش بکرێ.

بۆ جاری دوەم شانۆنامەیەکی تر پێشکەش کراوە. لەم بارەیەوە ژیان لە ژێر سەردێڕی (لە بینای زانستیدا تەمسیل) ریپۆرتاجێکی لە سەر نوسیوە، ئەڵێ:

"فەنی تەمسیل لە هەمو جێگایەک دا رەغبەتێکی تەواو و ئیمتیازێکی تایبەتی دراوەتێ، حەتا ئەوانەی کە لەم فەنە بە قیمەتەدا دەستدرێژی و ئیختیساسیان تیا پەیدا کردوە بە کەمالی ئیحتیرامەوە یاد و تەقدیر کراون، زیرا ئەم فەنە بە سەر ئەخلاقی میلەت، عاداتی مەملەکەت، ئەتوار و ئەفکاری ئینسان دا، تەئیسیرێکی باش ئیجرا ئەکات.

"لە لایەکەوە بینا بەم فکر و مەقصەدە و لە لایەکی ترەوە لە رێی تەئمینی مەنفەعەتی مەعاریف و مەکاتیبی سلێمانیدا، شەوی پێنجشەمە کە تەصادوفی ٢٧ ٢٨ ی تەموزی ئەکرد، لە بینای جەمعیەتی زانستیدا تەمسیلێکی تاریخی و ئەخلاقی لە تەرەف هەیئەتی تەعلیمیەی مەکتەبی ئەوەل و قوتابیەکانی بەغدامانەوە لە ژێر شەرائیت و پرۆغرامێک کە لە تەرەفی

هەیئەتی تەمسیلەوە تەرتیب کرابو، ئیجرا کرا. ئەم تەمسیلە چونکە لە ڕێی خدمەتی مەعاریف دا بو، ئەشراف و ریجالی مەملەکەت و هەمو موحیبان و تەرەفدارانی عیلم و مەعاریف، بە کەمالی شەوق و شەتارەتەوە ئیجابەتیان کردبو و گردبوبونەوە.

"ئەسلی تەمسیلەکە بە ٥ پەردە زوڵم و ئیستیبدادی بێ ئەندازەی قەیسەری ڕۆمی مەشهور ئیمپراتۆر نیرونی تەصویر و لە ژێر زوڵم و ئیستیبدادی ئەودا بە واسیتەی سیناتۆر ومیلەتپەروەرانی ڕۆماوە نەجاتدانی ڕۆماییەکانی تەمسیل ئەکرد.

"لە پەردەی ئەوەل دا، موفەصەلەن بۆ ڕزگارکردنی میلەت قەراری مەجلیسی سینات و، سەتوەت و حیشمەتی ئیمپراتۆر نیرون نیشان درا.

"لە پەردەی دوەم دا، معامەلاتی غەدارانە و مەزاڵیمی جەبارانەی ئیمپراتۆر نیرون تەمسیل کرا.

"لە پەردەی سێیەم دا، بەزم و کەیفی ئیمپراتۆر لە گەڵ مەحبوبەیەکیدا و بە سەراچونی ئیمپراتۆریچە و، لەو ئەسنایەیش دا سوتانی شاری ڕۆما و گوێ نەدانی ئیمپراتۆر بەم فاجیعەیە بە تەرزێکی حەقیقی خرایە بەر ئەنزاری تەماشاکەرانەوە.

"لە چوارەم پەردەدا، ئیختیلال و قیامی ئەهالی، ئیجتیماعی وەتەنیەکان لە گەڵ تەشویق و تەرغیباتیان ئیرائە کرا و،

"بە پەردەی پێنجەم کە ئاخر پەردە بو، لە سەر ئەحواڵی ڕابوردوی تەئەسوفات و پەشیمانی ئیمپراتۆر، وە لە بەر بێ عیلاجی و بێ چارەیی مانەوەیان، ئینتیحاری ئیمپراتۆر و ئیمپراتۆریچە بە حوزن و تەئسیرێکی گەورەوە تەصویر و تەمسیل کرا.

"ئەمانە عومومەن زۆر جوان و بە بێ نوقسانیەت ئیجرا کرا. لاوەکانمان لە گەڵ ئەمەی لە فەنی تەمسیل دا ئەوەل هەنگاوە ئەیهاون دیسان شایانی تەقدیر و تیزکارن.

"ئەم تەمسیلە بۆ ئەوانەی کە میقرۆبی ئیستیبداد و فکری زوڵم و تەحەکومیان لە کەللەدایە، جدەن دەرسێکی ئەخلاقی و عیبرەتێکی تاریخی بو. تەمسیل بە چەند درامێکی موزحیک و هەزەلی خیتامی پێ هێنرا و بلاوەی لێ کرا. لە ڕێی تەعالی و تەرەقی مەعاریف دا سەعی و کۆششی هەیئەتی تەعلیمیە و لاوەکانمان تەقدیر و، لەم فەنەدا دەستدرێژیان تیزکار ئەکەین."(ژیان، ژ ٧٦، ٢ ی ئاغستۆسی ١٩٢٧)

## ٨. پرسەی ئەدیبان

ژیان هەواڵی مردنی هەندێ کەسایەتی بلاو کردۆتەوە کە زانینیان بۆ دنیای ئەدەب و رۆژنامەوانی کوردی بایەخدارن، لەوانە:

شوکری فەزلی

"انا لله وانا...

لە غەزەتەکانی بەغدادەوە بە کەمالی تەئەسور و تەئەسوفەوە خەبەری وەفاتی شاعیر و ئەدیبی بە ناو مەرحوم شوکری فەزلی‌مان خوێندەوە. بۆ عالەمی کوردایەتی جدەن زیاعێکی ئەلیم و گەورەیە. حەق تەعالا بە رەحمەتی خۆی عەفوی کات."( ژیان، ژ ٢١، ١٧ ی حوزەیرانی ١٩٢٦)

شوکری فەزلی یەکێ لە ئەدیب و رۆژنامەوانە ناسراوەکانی عیراق بوە. بە تورکی و فارسی و عەرەبی وتاری بۆ رۆژنامەی جیاواز نوسیوە. چەند وتارێکی بە تورکی و عەرەبی لە سەر مێژوی کورد نوسیوە. لە گەڵ شێخ رەزای تاڵەبانی شەڕە شیعری زۆری هەیە. نوسەری سەرەکی (تێگەیشتنی

راستی) بوه كه دەسەڵاتی ئینگلیزی لە بەغداد بە زمانی کوردی لە ١ ی ١ ی ١٩١٨ دا دەری کردوه.

سلێمان نەزیف

"سلێمان نەزیف ئەدیبی مەشهوری ئیستامبول كه کوڕی سەعید پاشای دیاربەکری مەشهور بو لە ئیستانبول وەفاتی کردوه."(ژیان، ژ ٥٢، ٣ ی شوباتی ١٩٢٧)

کەریم بەگی کەرکوکلیزادە

"زیاعێکی ئەلیم

"لە ئەشراف و خانەدانی سلێمانی و لە ریجالە حقوقیە مەشهورەکانمان، حاکمی مونفەریدی سلێمانی کەرکوکلی زادە عەبدولکەریم بەگ بە سەبەبی ئەو نەخۆشیەوە كە توشی بوبو دوێنێ نیوەڕۆ ئەمری خوای بە جێ هێنا.

"ئوفولی ناگەهانی ئەم زاتە قیمەتدارە تەئسیرێکی تەواوی کردە هەمو کەسێکەوە و هەمو لایەکی خستە حوزن و تەئەسورەوە.

"سەعادەتی موتەسەریفی ئەکرەمی و رونەسای دەوائیر و عولەما و ئەشرافی شار و سائیری تەبەقاتی ئەهالی بۆ تەجهیز و تەدفینی حازری سەر جەنازەکەی بون و هەتا سەرقەبران تەشیعیان فەرمو.

"بە ناوی عومومەوە بەیانی تەعزیەت لە عائیلەی کەدەردیدەی ئەکەین و تەمەنا ئەکەین خوای تەبارەک و تەعالا تەسەلیان پێ ببەخشێ و مەرحومیش غەریقی رەحمەت بکات."(ژیان، ژ ١٩٩، ١٩ ی ئەیلولی ١٩٢٩)

کەریم بەگ، هەمان (عەبدولکەریم سلێمانی) یە كە ساڵی ١٩١٣ لە ئەستەموڵ گۆڤاری (رۆژی کورد) ی دەرکردبو.

### ٩. هەواڵی ڕۆژنامەوانی

"غەزەتەی وطن

سکرتێری حیزبی وطنی عیراق تەلەبی لە وەزارەتی داخلیە کردوە کە مەئزونیەتی بدەنێ غەزەتەیەک بە ناوی (وطن) ەوە و بە ناوی حیزبەکەیەوە دەربێنێ."(ژ ١٣٩)

"غەزەتەی التقدم

لە بەغدادەوە لە تەرەف حیزبی تەقەدومی عیراقەوە لە تەحتی ئیدارەی سلێمان شێخ داودا غەزەتەیەک بە ناوی (التقدم) ەوە ئینتیشاری کردوە."(ژ ١٣٩)

"صوت العراق

بەغداد: مەعالی موزاحیم بەگ ئەل پاچەچی تەلەبی لە وەزارەتی داخلیە کردوە کە مەئزونیەتی بدەنێ غەزەتەیەکی سیاسی بە ناوی (صوت العراق) ەوە دەر بهێنێ."(ژ ١٤٨)

"النجم

بەغداد: لە ئیدارەی پاتریارکیەی کلدانیدا لە موسل مەجەلەیەک ئینتیشار ئەکات بە ناوی (النجم) ەوە."ژ (١٤٨)

"غەزەتەی (فتی العراق) لە موسل دا

"بەغداد: مودیریەتی مەتبوعات مەئزونیەتی داوە بە مەتی سرسم ئەفەندی کە لە موسل دا غەزەتەیەکی سیاسی یەومی بە ناوی (فتی العراق) ەوە دەربهێنێ.

"مەئزونیەتیشی داوە بە فائیق ئەفەندی کە لە بەغداد بە ناوی (الحارس) ەوە غەزەتەیەکی ئەدەبی دەربهێنێ."(ژ ٢٠٧)

"جەمعیەتی هیدایەتی ئیسلامی

"بـەغداد: كۆمـەڵی هیدایـەتی ئیسـلامی لـە بـەغداد غەزەتەیـەكی دەرهێناوە بە ناوی هدایتەوە و مەوزوعەكانی هەمو عیبارەتن لە مەسـائیلی دینیە و ئەخلاقیەی ئیسلامیەت."(ژ ٢٣١)

سەردانی سلێمانی

"ساحیبی غەزەتـەی الكـرخ و سـەحافی شـەهیر جـەنابی مـەلا عـەبود ئەفەندی ئەل كەرخی بۆ چاوپێكەوتنی لیواكەمان تەشریفی هێناوەتە سلێمانی. عەرزی بە خێرهاتنی ئەكەین."(ژ ٨٤)

"مومەسیلی غەزەتـەی (فتـی العـربـ) محێدین بـەگ لـە بـەغدادەوە بـۆ چاوپێكـەوتنی لیواكـەمان تەشـریفی هێنـا بـوە ئـێرە لـە دوای ٤ رۆژ عـەودەتی فەرموەوە. خوای لە گەڵ بێ."(ژ ٩٤)

"موعتەمیدی غەزەتەی كەركوك

"بۆ ئەوەی بەدەلاتی غەزەتەكەیان كۆ بكاتەوە موعتەمیدێكی غەزەتەی (كـەركوكـ) رەفیقـی خۆشەویسـتمان تەشـریفی هێناوەتـە سـلێمانی. رجـا لـە مشتەریەكانی ئەكەین معاوەنەتی بفەرمون و بەدەلاتەكەی بە تەواوی تەسلیم بكەن."(ژ ١٨٤)

داخستنی رۆژنامەی عیراقی

"هەواڵی داخلی: رۆژنامەی نهضة و زمان لـە تـەرەف حكومەتـەوە لـە نەشر كردن مەنع كراوە."(ژ ٨٨)

"غەزەتەی التقدم

بەغداد: لە بەر بەعزێ ئەسبابی سیاسیە غەزەتەی التقدم چەند ڕۆژێک دەرناچێ لە دواییدا لە سەر حسابی خۆی مودیری غەزەتەکە سەلمان ئەل شێخ داود دەست ئەکاتەوە بە ئینتیشاری. "(ژ ١٧٤)

"غەزەتەی نهضة و وطن
بەغداد: لە سەر ئەوەی مەجلیسی وزەرای عیراق قەراری داوە غەزەتەی نهضة و وطن ئیتر ئینتیشار نەکات یاسین پاشا تەکلیفی لە ساحیبی غەزەتەی وطن کردوە بە ناوی (الشعب) ەوە و تەکلیفیش لە النهضة کراوە بە ناوی (صدى العراق) ەوە غەزەتەکانیان دەربێنن. "(ژ ١٩٧)

"مەعروف ئەل ڕەصافی و غەزەتەی بلاد
"بەغداد: لە سەر ئەوەی مەعروف ئەفەندی ئەل ڕەصافی لە غەزەتەی البلادا مەقالەیەکی نوسیوە و گۆیا ئەڵێن مەقالەکە لە عەلەیهی پێغەمبەر بێ ئەدەبیەکی تیادا بوە وەکو لە مەجلیسی نیابیدا شکاتی لێ کرا و وەزیری داخلیە قەولی دا تەدقیقی مەسئەلەکە بکات.
"ئەڵێن کۆمەڵی شوببانی موسلیمین یش لە مەحکەمەدا دەعوایان لە عەلەیهی ساحیبی مەقالەکە و ناشیرەکەی کردوە هێشتا محاکەمە نەتیجەی نەهاتوە بەڵام ئەڵێن حکومەتی ئەمری داوە غەزەتەی بلاد ١٥ ڕۆژ ئینتیشار نەکات. "(ژ ٢١١)

لابردنی مەنع لە سەر جەریدەکانی تورکیا
"مودیریەتی مەتبوعات ئەوامیری لازمەی دا بە هەڵگرتنی مەمنوعیەت لە خسوس ئیدخالی هەمو نەوعە غەزەتەی تورکیا بە عیراق. "(ژ ٣٨)

لابردنی مەنع لە سەر ڕۆژنامەی بلاغی میسری

"غەزەتەی بلاغ ی میسر سەربەست کراوە

"بەغداد غەزەتەی (بلاغ) ی میسری کە مەنع کرا بو بێتە بەغداد، ئەمجارە وەزارەتی داخلیە ئەمری داوە کە سەربەست بێتە عیراق و هیچ مانعێک نیە لە هاتنیا."(ژ ٢٠٧)

"مودیر و موحەریری غەزەتەی الزمان

بەغداد: لە موحەریرینی مەشهور و ساحیب و موحەریری غەزەتەی الزمان ئیبراهیم ئەفەندی سالح شوکر کە بەینێک لەمەوپێش چو بوە میصر، خەریکە بگەڕێتەوە سوریە و لە شاما هەر بە ناوی الزمانەوە غەزەتەکەی دەربهێنێ."(ژ ١٤٤)

"غەزەتەی وەفدی میصری

لەندەن: جەمعیەتی حیزبی وەتەنی میصر لە لەندەنا دەستیان کردوە بە دەرهێنانی غەزەتەیەک بە ناوی وەفدی میسرییەوە."(ژ ١٤٦)

# ژیان
# و
# هەواڵی دەرەوە

١. ژیان و هەواڵ

١. ١. جوگرافیای هەواڵەکان

١. ٢. بابەتی هەواڵەکان

١. ٣. سەرچاوەکانی

٢. هەواڵەکانی تورکیا

٢. ١. هەواڵی ناوخۆی تورکیا

٢. ٢. پێوەندی عیراق و تورکیا

٢. ٣. هەواڵی شۆڕشی کوردەکانی تورکیا

٣. هەواڵەکانی ئێران

٣. ١. پێشکەوتنی ئێران لە سایەی رەزا شادا

٣. ٢. کێشەی ناوخۆ

٣. ٣. پێوەندی ئێران و وڵاتانی دنیا

٣. ٤. پێوەندی عیراق و ئێران

٣. ٥. کۆنسوڵگەی ئێران لە سلێمانی

٣. ٦. هەواڵی جۆراوجۆر

### ١. ژیان و هەواڵ

ژمارەکانی ساڵی یەکەمی تا ساڵی حەوتەمی ژیان رۆژنامەیەکی پڕ لە هەواڵ و دەنگوباسی ناوخۆ و دەرەوەیە. لە ژ ١٣٤ ەوە تا ژ ٢٧٠ حەفتەی دو جار دەرچوە (لە دوای ئەم ژمارەیەوە چەند ژمارەیەک لە مەجموعەکەی بەردەستی من دا نەماوە لە بەر ئەوە بە مەزبوتی نەمزانی تا ژمارەی چەندەمی حەفتەی دو جار دەرچوە). هەواڵەکانی پڕن لە ئاگاداری گرنگ و زانیاری بەسود بۆ رۆشنکردنەوەی بیری خوێندەوار دەربارەی روداوەکانی سلێمانی و عیراق و دەوڵەتانی دراوسێ و دنیا.

ژیان هەواڵەکانی ناو لاپەڕەکانی پۆلێن کردوە: روداوەکانی دنیای لە ژێر سەردێڕی (هەواڵی خاریجی) و دواتر (هەواڵی دەرەوە) دا نوسیوە. تا ماوەیەک روداوەکانی بەغداد و عیراقیشی هەر لەم گۆشەیەدا بلاو کردۆتەوە و ماوەیەکیش روداوەکانی بەغدادی لە ژێر سەردێڕی (خەبەراتی بەغداد) ا نوسیوە.

لە بەرامبە (هەواڵی خاریجی) و (هەواڵی دەرەوە) دا، سەرەتا روداوەکانی سلێمانی لە ژێر سەردێڕی (هەواڵی ناوشار) دا و، هەندێ جار لە ژێر سەردێڕی (دەنگوباس) دا و دواتر لە ژێر سەردێڕی (هەواڵی داخلی) دا، نوسیوە. چەند جارێکیش بۆ هەواڵی جۆراوجۆر سەردێڕی (خەبەراتی موتەفەڕیقە) و (هەواڵی موتەفەڕیقە) ی بە کار هێناوە.

تا سەردەمی پیرەمێرد هەمو ژمارەکانی ژیان (هەواڵی دەرەوە) ی تێدا بلاو کراوەتەوە، لە سەردەمی پیرەمێردا رۆژنامەکە لەم روەوە بۆ دواوە چونێکی ئاشکرای پێوە دیارە، چونکە ئیتر بە دەگمەن هەواڵی دەرەوەی نوسیوە، ئەگەر بلاویشی کردبێتەوە لە گۆشەیەک دا بلاو کراوەتەوە ناوی لێ ناوە (لەم لا و لەو لاوە) هەواڵەکەیش بە شێوەیەک داڕێژراوە، کە زۆرتر لایەنی پەخشانی ئەدەبی بە سەردا زاڵە، تا گێڕانەوەی هەواڵ.

(ژیان) لەو ماوەیەدا کە عەلی عیرفان بە ڕێوەی بردوە، لە چاو سەردەمی هەر ۳ سەرنوسەرەکەی تری دا، لە هەواڵی دەرەوە و ناوخۆدا دەوڵەمەنترە و لە ڕۆژنامەیەکی هاوچەرخ ئەچێ. بەڵام (ژیان) ی سەردەمی پیرەمێرد زۆرتر لە بڵاوکراوەیەکی ئەدەبی - ناوچەیی ئەچێ تا ڕۆژنامە. ڕەنگە ئەمەیش بگەڕێتەوە بۆ هەلومەرجی سیاسی ئەو سەردەمەی عیراق، بۆ ئەوەی ڕۆژنامەکە کۆسپی نەهێنرێتە ڕێگا و دانەخرێ پیرەمێرد ئەم ڕێبازەی بۆ هەڵبژارد بێ، یان ئەوەتا پیرەمێرد کە خۆی زۆرتر شاعیر و ئەدیب بوە ویستبێتی ئەم ڕێبازەی بۆ دیاری بکات و، هەواڵی دەرەوەی بە شتێکی زیاد زانی بێ.

## ۱. ۱. جوگرافیای هەواڵەکان

هەواڵی سلێمانی، کە لە سەرەتادا لە ژێر ناوی (هەواڵی ناوشار) و هەندێ جار لە ژێر ناوی (دەنگوباس) و دواتر لە ژێر ناوی (هەواڵی داخلی) و (هاتن و ڕۆیشتن) دا بڵاوی کردۆتەوە، بریتی بوە لە: (هاتن و ڕۆیشتن) ی موتەصەریف، موفەتیشی ئیداری، مەبعوسەکان، کاربەدەستانی تری عیراقی و ئینگلیزی، سەرانی خێڵەکان، تەعین و گواستنەوەی فەرمانبەران، مردنی کەسانی ناسراو، کارەکانی شارەوانی، باران. ...تاد

نمونە: ژ ۱۷۰ ی ۲ ی نیسانی ۱۹۲۹: "(باران - ڕەحمەت)

"لە حەڵێکا کە بەینێک بو باران نەئەباری و هەمو دەغڵ و دانی وڵاتەکەمان بارانی ئەویست بە سەبەبی لوتفی خوای مەزن و گەورەوە شوکور لە بەیانی ڕۆژی دوشەمەوە هەتا بەیانی ڕۆژی چوار شەمە، دو شەو و دو ڕۆژ لە سەر یەک، لە وڵاتەکەمانا باران باری و ئەم ڕەحمەتە بە سەر خاکەکەمانا ڕژایە خوارەوە و هەمو دەغڵ و دان و سەوزایی زیندو کردەوە. هیوامان وایە

چۆن ئەم رەحمەتەمان بە سەردا رژا هەروا توشی هەمو خۆشیەک بین و ئینشائەلاّ ئەمە نیشانەیەکی ئیقبالمانە."

هەواڵی عیراق، کە هەندیّ جار لە ژێر ناوی (خەبەراتی بەغدا) و هەندیّ جاری تر لە ژێر ناوی (هەواڵی خاریجی) و دواتر لە ژێر ناوی (هەواڵی داخلی) دا بلاّوی کردۆتەوە بریتی بوە لە: دەنگوباسی مەلیک فەیصەل، ئەنجومەنی وەزیران، ئەنجومەنی مەبعوسان و ئەعیان، مەندوبی سامی، گفتوگۆی نوێنەرانی عیراق لە گەڵ بریتانیا، تورکیا، ئێران، نەجد، ناردنی دیپلۆمات بۆ ولاّتان و وەرگرتنیان لە بەغداد. ...تاد

هەواڵی دراوسێکانی عیراق (تورکیا، ئێران، سوریا، شەرقی ئوردون، نەجد) کە لە ژێر ناوی (هەاڵی دەرەوە) دا بلاّوی کردۆتەوە، بریتی بوە لە: دەنگوباسی ناوخۆی ئەو ولاّتانە.

هەواڵی دەوڵەتانی ئەوروپی

هەواڵی ولاّتانی ئاسیایی و ئەفەریقایی

هەواڵی روسیا و بۆلشەویک

ئەوەی سەرنج رائەکێشیّ ژیان لە ناو هەواڵەکانی دەرەوەیدا گرنگیەکی تایبەتی داوە بە هەواڵەکانی هەندیّ ولاّت، لەوانە:

- ئەفغانستان، کە لەو کاتەدا شەڕی ناوخۆی تیّدا بوە.

- میصر، بە درێژی باسی سەعد زەغلول و تێکۆشانی میسریەکان ئەکا لە پێناوی سەربەخۆیی ولاّتەکەیان و، رەوتی گفتوگۆی میسر و بریتانیا باس ئەکا.

- هیند، هەواڵەکانی غاندی و تێکۆشانی گەلانی هیندستان دژی بریتانیا لە پێناوی سەربەخۆیی دا بلاّو کردۆتەوە، باسی مانگرتن و خۆپیشاندان و (عسیانی مەدەنی) ئەکا.

### ١. ٢. بابەتی هەواڵەکان

هەواڵی سیاسی

هەواڵی رۆشنبیری

هەواڵی کۆمەڵایەتی

هەواڵی ئابوری

هەواڵی جۆراوجۆر

### ١. ٣. سەرچاوەی هەواڵەکان

داوودەزگاکانی حکومەتی سلێمانی

سەرچاوەی تایبەتی (موخابیری مەخسوس)

رۆژنامە عەرەبیەکانی عیراق

رۆژنامەکانی دنیا

## ٢. هەواڵی تورکیا

### ٢. ١. هەواڵی ناوخۆی تورکیا

"جەمعیەتێکی سرِی لە تورکیا

"ئەنقەرە، جەمعیەتێکی سرِی لە تورکیادا کەشف کراوە کە خەریکی ئینقیلاب بون و لە ئەستانبول و ئەنقەرە و ئەناتۆلیدا زۆر کەسیان لێ گیراوە و لە محاکەمەیان دا مودەعی عام تەلەبی ئیعدامی کردون."(ژیان، ژ ١٥٤، ٧ ی شوباتی ١٩٢٩)

"مەحکەمەی تورکیا

"ئەستانبول، محاکەمەی ئەو شەخسانە تەواو بوە کە خەریک بون لە تورکیادا ئینقیلاب بکەن و پیاوە گەورەکانی حکومەت بکوژن. لەمانە ٥ کەسیان بە ئیعدام و ١٦ کەسیشیان لە مودەی موختەلیف مەحکوم کراون."(ژیان، ژ ١٥٨، ٢٨ ی شوباتی ١٩٢٩)

"حدودی سوریە و تورکیا

"ئەستانبول، حکومەتی تورکیایش موقابەلەتەن خەریکە ئەساسێک دامەزرێنیّ بۆ موقابەلەی ئەو چەرکەس و ئەرمەنی و کوردانەی کە فرانسە بە قەسدی بۆ ئەوەی دائیمەن تەجاوزی ئەرازی تورکیا بکەن لە حدودا ئیسکانیان و معاوەنەتیان ئەکا."ژیان، ژ ١٦٣، ١ ی نیسانی ١٩٢٩)

"محاکەمەی قەدریە خانم

"ئەنقەرە، ئەو جەمعیەتی کە بە کوشتنی مستەفا کەمال پاشاوە موتەهەم کرا بون و لە تەرەف حکومەتی تورکەوە دەردەست کرابون و کە عیبارەتن لە قەدریە خانم و رەفیقەکانی. لە نەتیجەی تەحقیقاتی حیکمەت بەگ موستەنتەق دا وا مەعلوم بوە کە مەسئەلەکە راستە و زۆر ئەوراقی سبوتیەیان دەردەست کردوە و لە سەر ئەمە سەوقی مەحکەمەی جینایەت کراون.

"مەعلوم بوە کە رەئیسی ئەم جەمعیەتە رەئوف بەگ قوماندانی حەمیدیەیە. دوقتۆر عەدنان بەگ و ژنەکەی خالیدە ئەدیب خانم و قەدریە خانم و روفەقای ئەعزای موهیمی ئەم جەمعیەتە بون."ژیان، ژ ١٧٨، ٦ ی حوزەیرانی ١٩٢٩)

"کردنەوەی مەجلیسی وەتەنی کەبیری تورکیا و خوتبەی غازی مستەفا کەمال پاشا

"لەندەن، مەجلیسی وەتەنی کەبیر کراوەتەوە، لە ئەوەل جەلسەدا رەئیس جمهور غازی مستەفا کەمال پاشا نوتقی ئیفتیتاحی داوە کە زۆر موئەسیر بوە. وە حکومەت هەمو تەرتیباتێکی لە پێشەوە حازر کردوە کە نوتقەکە بە واستەی جیهازی بێتەلەوە لە ئەوروپا و ئەمەریقادا بلاو ببێتەوە و خەلق گوێی لێ بگرن."ژیان، ژ ٢١١، ١٤ ی تشرینی دوەمی ١٩٢٩)

"تورکەکان رۆژی یەکشەممە ئەکەن بە ئەیامی رەسمی

"ئەستانبول، حکومەتی تورکیا خەریکە لائیحەیەکی قانونیە کە بۆ تەسدیق بیدات بە مەجلیسی وەتەنی کەبیر بۆ ئەوەی لەمەولا لە جیاتی رۆژی جومعە رۆژی یەکشەمە بکرێ بە رۆژی تەعتیلیە و لەو رۆژەدا دەوائیری حکومەتی نەبێ."(ژیان، ژ ۲۱۳، ۲۸ ی تشرینی دووەمی ۱۹۲۹)

............

"تورکەکان ساڵی هیجری بە میلادی ئەگۆڕنەوە

"ئەستەموڵ ۲۸ ی مینهو، مەجلیسی ئەنقەرە تەسدیق و قەراری دا کە لەمەودوا ساڵی میلادی بۆ حکومەتی تورکیا بە تاریخی رەسمی دابنرێ و ئەوەی رۆژی کانونی سانی بە سەری ساڵ ئیعتیبار بکرێ و، تاریخی هیجری جارێکی تر ئیستیعمال نەکرێ."(ژیان، ژ ۱، ۲۱ ی کانونی سانی ۱۹۲۶)

"هەواڵی تورکیا:

"سوئی قەسد دەرحەق بە مستەفا کەمال پاشا

"ئونقەرە، ئەو قۆمیتەیەی کە تەشەکولی کردبو بۆ کوشتنی مستەفا کەمال پاشا کە بۆ ئیزمیر چونی موقەرەر بو رۆژێ لە پێش گەیشتنیا کەشف کرا و هەمو گیران. لە مەبعوسینی لازستان زیا خورشید بەگ ریاسەتی ئەم قۆمیتەیەی ئەکرد. گەلێ پیاوی مەعروف و بە ناو داخلی ئەم تەشکیلاتەیە. ئەم قۆمیتەیە زۆر گەورە و گەلێ شوعبەی بوە. تەعقیبات و تەحەرییات لە سەر دەوامە.

"چەند کەس گیرا؟

"ئەستەموڵ، ۳ رۆژە تەوقیفات دەوام ئەکات. گیراوەکان ئەنێررێنە ئیزمیر، قوماندانی فیرقە و مەرکەز و مودیری پۆلیس موشتەرەکەن نەزارەتی ئەم ئیشە ئەکەن، لە گیراوەکان هەندێکیان ئەمانەن:

"مەبعوسی ئەستەموڵ رەفعەت پاشا، ئیسماعیل جانبولات بەگ نازری مەعاریفی پێشو و مەبعوسی ئیزمیت شەکری بەگ، مەبعوسی ئەرزرۆم رەشدی پاشا، لە مەبعوسەکانی تر بەکر سامی، عابدین، فائیق، تەحسین، خوسۆەو، سابیت، عارف، حازم، خالس تورغود، حالەت، ئیحسان بەگ و، لە مەبعوسە کۆنەکان حسێن عەونی، ئەیوب سەبری، زیا خورشید، قەرە واسیف، عەلی شەکری، تەلعەت، ناجی بەگ و، جەمال پاشای پچوکە.

"ئەرکانی فیرقەی تەرەقیپەروەریش هەمو مەزنونن

"ئەستەموڵ، تەحەقوقی کرد کە ئەم سوئی قەسدە لە تەرەف فیرقەی تەرەقیپەروەرەوە تەرتیب کراوە. لە بەر ئەمە ئەرکانی فیرقە هەمو مەزنونن. کازم قەرەبەکر و عەلی فوئاد پاشاش تەوقیف کراون.

"کێ ئەم قۆمیتەیەی ئاشکرا کرد؟

"ئیزمیر، لە تەرتیباتی ئەم سوئی قەسدە یەکێکی کریدی کە ناوی شەوقی بەگە حکومەتی خەبەردار کردوە، کە خۆشی یەکێ بوە لە ئەعزای ئەم قۆمیتەیە. شەوقی بەگ لە هەمو تەرتیباتەکە ئاگادار بوە بە تەفسیلاتیەوە خەبەری بە حکومەت داوە.

"حوکمی ئیعدام دەرحەق بە ١٥ کەس لە ئیزمیر

"لۆندرە ١٣ ی مینهو، لە خەبەراتی ئەستەموڵەوەیە: کە مەحکەمەی ئیستیقلال لە ئیزمیر حوکمی ئیعدامی داوە دەرحەق بە ١٥ کەس کە لە مەسئەلەی کوشتنی مستەفا کەمال پاشاوە موتەهەم بون."(ژیان، ژ ٢٦، ٢٩ ی تەموزی ١٩٢٦)

"ئیکرامیە بۆ شەوقی بەگ

"ئیزمیر، شەوقی بەگ کە لە تەرتیباتی قەستی کوشتنی مستەفا کەمال پاشا حکومەتی خەبەردار کرد بو، تەقەروری کرد کە ٣٠ هەزار لیرە ئیکرامیەی بدرێتێ.

"رەئیس جمهور بیلزات خۆی ئیستیجواب ئەکا

"ئیزمیر، مستەفا کەمال پاشا لە مورەتیبینی سوئی قەسد مەبعوسی لازستان زیا خورشید بەگی جەلب و بیلزات خۆی ئیستیجوابی کردوە. موما ئیلەیهی هەمو تەرتیباتەکەی بە بێ تەرەدود ئیعتیراف کردوە."ژیان، ژ ٢٧، ٥ ی ئاغستۆسی ١٩٢٦)

"یەکێ لە ئەعزاکانی جەمعیەتی ئیتیحاد ئینتیحاری کردوە

"لۆندرە، لە خەبەراتی ئەستەمولەوەیە: کە یەکێ لە ئەعزاکانی پێشوی جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی قەرەکەمال بەگ کە مەحکەمەی ئیستیقلال غیابەن حوکمی بە سەرا دابو لە بەر ئەوەی کە ئیشتیراکی قۆمیتەی سوئی قەستی مستەفا کەمال پاشای کرد بو، لە سەر ئەمەی کە پۆلیس ئیختیفاگاهەکەی دۆزی بوەوە لە ترسی گرتن ئینتیحاری کردوە."ژیان، ژ ٢٨، ١٢ ی ئاغستۆسی ١٩٢٦)

"ئاخریەکەی ئیعدام کرا

"لۆندرە، لە ئەستەمولەوە خەبەر هات کە مەحکەمەی ئیستیقلال حوکمی ئیعدامی بە سەر والی پێشوی ئەنقەرە عەبدولقادر بەگ داوە، چونکە عەبدولقادر بەگ یەکێکە کە لە قۆمیتەی قەسدی کوشتنی مستەفا کەمال پاشاوە موتەهەمە، موما ئیلەیهی بۆ فیرارکردن و خۆ شاردنەوە زۆر هەوڵی دا فەقەت هەمو مەساعیەکی بێ سەمەر مایەوە، ئاخریەکەی پۆلیس بە گرتنی ئیمکانیان بۆ حاسڵ بو و حوکمە ئیعدامی تیا ئینفاز کرا."ژیان، ژ ٣٣، ١٦ ی ئەیلولی ١٩٢٦)

"سەفیری تورکیا لە ئامریقا

موختار بەگ کە لە تەرەف تورکیاوە بە سەفیری ئامریقا تەعین کراوە، لە گەڵ مواسەلەتی نیۆرق، لە هەمو لایەکەوە غەیر رەسمی لە تەرەف ئەهالیەوە، کۆمەڵ کۆمەڵ تەحقیر کراوە. حەتا لەو ئەسنایەدا موسیۆ ژمراری

ئامریقایی که له پێشا سەفیری ئامریقا ئەبێ له بەرلین نوتقێک ئەدا ئەڵێ ئەم موختار بەگە له ساڵی ١٩٢٠ دا بوه بە سەبەبی قەتلی ٣٠ هەزار ئەرمەنی و دیسانەوە ئەڵێ هەر بە واسیتەی تەشەبوسی ئەم شەخسەوە حکومەتی بۆلشەویک هجومی کردە سەر ئەرمەنستان و ئیشغالی کرد، لە بەر ئەمە بونی ئەم زاتە لێرەدا زۆر عەیب و عار تەشکیل ئەکات بۆ حکومەتی ئامریقا کە هەمو ئامالی خزمەتکردنی بەشەرە.

"ئەو زاتانەیش کە موعاهەدەی لۆزانیان بە ئەکسەریەت قبوڵ نەکرد، لە مەجلیسی مەبعوسانی ئامریقادا دیسانەوە زۆر لە عەلەیهی هاتنی ئەم سەفیرەن و، لە بەر ئەمە حکومەتی ئامریقا مەجبور بوە کە بە واسیتەی پۆلیسەوە محافەزەی ئەم سەفیرە بکات و، یەمنزیکانە ئەم مەسئەلەیە لە مەجلیسی شیوخی ئامریقادا مەوزوعی بەحس ئەبێ."(ژیان، ژ ٩٧، ١٠ ی کانونی سانی ١٩٢٨)

## ٢.٢. پێوەندی عیراق و تورکیا

"هەواڵی خاریجی:

"مەسئەلەی موصل، شەرائیتی ئیتیفاق بەینی تورکیا و بریتانیا

"لۆندرە، ٢٤ ی نیسان: غەزەتەی العالم العربی لە غەزەتەی دەیلی هێرالدەوە مەوادی ئاتی ئیقتیباس و نەشر کردوە:

"دەوائیری رەسمیەی بریتانیا بە تەواوی ئیعتیمادیان پەیدا کردوە کە مەسئەلەی بەینی بریتانیا و تورکیا بەم نزیکانە حەل و تەسویە ئەکرێ. سێر ئۆستن چەمبەرلاین لە لۆندرە لە گەڵ سەفیری تورکیادا مولاقاتی کرد و تێی گەیاند کە حازرە بۆ قبوڵکردنی بەعزێ ئیقتیراحاتی تورکیا. لە سەر ئەمە ئیستا حکومەتی تورکیا ئامادەیە بۆ ئیعتیراف کردن بەمەی کە موصل جوزئی موتەمیمی عیراقە موقابیل بە شروتی ئاتیە:

١. ئیجرائی تەعدیلات لە حدودی بەینی تورکیا و عیراق.

٢. تەئمینات بدرێ کە موسامەحەی کوردە عاصیەکان نەکرێ بەمەی کە لە ئەرازی ژێر حوکمی بریتانیادا جیٚیان بکرێتەوە.

٣. ئەبێ حکومەتی تورکیا لە رەسمی مەنافیعی نەوتی موصلدا بەشدار بێ.

٤. ئەبێ لە بازاڕی لۆندرەدا قەرزێک بە تورکیا بدرێ.

بەستنی موعاهەدەیەکی قەوی لە بەینی تەرەفەین دا عەلاوەی ئەم شەرتانە ئەکرێ. بە عەقدی ئەم موعاهەدەیە موقەڕەڕە کە حکومەتی تورکیا بۆ داخل بونی بە جەمعیەتی ئەقوام دەستبەجێ تەلەب و داوا بکرێ و، موعاهەدەی حالیەی روسیای تەبدیل بکا بە موعاهەدەیەکی یارمەتی لە گەڵ سیاسەتی بریتانیادا.

وە مەعلومە کە ئەگەر ئیتیفاقی بەینی بریتانیا و تورکیا تەواو ببێ، ئەو وەختە حکومەتی بریتانیا بە هەمو هێز و قوەتی خۆی سەعی ئەکا بۆ مەنعی هەج هجوم و تەعەڕوزێ کە لە ئیتالیا و یۆنانەوە واقیع ئەبێ بۆ سەر تورکیا. ئەم تەهدیدی ئیتالیا و یۆنانە بۆ وەزارەتی خاریجیەی بریتانیا خالی لە فائیدە نەبو، فەقەت لە پاش عەقدی ئیتیفاق لە گەڵ حکومەتی تورکیادا ئیحتیاجی بەم وەسیلەیە نامێنێ." (ژیان، ژ ١٦ ی ١٣ ی مایسی ١٩٢٦)

"هەیئەتی عیراق بۆ ئەنقەرە

"وەکو زانراوە حکومەت بۆ موزاکەرە و عەقدی موعاهەدەی بەینی عیراق و تورکیا هەیئەتێکی تەئلیف کردوە و ئەیانێرێ بۆ ئەنقەرە. ئەم هەیئەتە لە مەعالی وەزیری دیفاع نوری سەعید پاشا بە صیفەتی وەزیری مفەوەز لە حکومەتی عیراقەوە و مودیری عەدلیە سەعادەتی توفیق بەگ سویدی بە ناوی سکرتێرەوە و جەنابی سلێمان بەگ فەتاح بە ناوی مورافیقی وەزیر، تەعیین و تەئلیف کراوە.

"ئەم هەیئەتە ئەمرۆ سبحەی بە تەیارە رو بە ئەنقەرە حەرەکەت ئەکات لەوە رەنگبێ تا ئیستا حەرەکەتیشی کردبێ بۆ ئەمەی کە زو بگەن بە سەر ئەو موزاکەرانەی کە ئیستا لە بەینی حکومەتی بریتانیا و مومەسیلی تورکیادا جەرەیان ئەکا. ئومێد ئەکەین کە ئەم موزاکەراتە بە تەصدیقی مانەوەی موصل بۆ عیراق نەتیجەپەزیر بوبێ."ژیان، ژ ١٩، ٣ ی حوزەیرانی ١٩٢٦)

"موعاهەدەی بەینی عیراق و تورکیا

"٧ ی حوزەیرانی ٢٦: بە پێی تەلغرافێک کە لە وەزارەتی جەلیلەی داخلیەوە بۆ مەقامی موتەصەرپیفیەت هاتوە لە ئەنقەرە مفاوەزات بە کەمالی موەفەقیەت ئیجرا و موعاهەدەی بەینی عیراق و تورکیا ئیمزا کراوە."ژیان، ژ ٢٠، ١٠ ی حوزەیرانی ١٩٢٦)

" ئیحتیفال بە موناسەبەتی تەصدیقی موعاهەدەی بەینی تورکیا و عیراق

"صورەتی موتەرەجەمەی تەلغرافی بێتەل ژمارە ٨٠٥٨ و رۆژی ١٤ ی حوزەیرانی ١٩٢٦ وەزارەتی جەلیلەی داخلیە بۆ موتەصەرپیفی لیوای سلێمانی:

"مەجلیسی مەبعوسان ئەم بەیانیە موعاهەدەی تورکی تەصدیق کرد. نوقاتی ئەساسیە عیبارەتە لەوە کە حکومەتی تورکیا ئیعتیراف بە ئیستیقلالیەتی عیراق کرد و ولایەتی موصل، کە موافیقی خەتی برۆکسل تەعین کراوە، بە جوزئێکی موتەمیمی عیراق ناسیوە. نوسخەی موعاهەدەکە بە پۆستەدا نێرراوە. ئەم نوقتە مەسعودە کە لەمەدا تەئسیسی موناسەباتی دۆستانە لە گەڵ حکومەتێکی دراوسێمانا کراوە و کە بە واسیتەی ئەوەوە تاجی زەفەر لە سەر جەهد و تەشەبوساتی ئێمە دانراوە، لازمە حەفلەی بۆ ئیجرا بکرێت."ژیان، ژ ٢١، ١٧ ی حوزەیرانی ١٩٢٦)

لە ژ ۲۲ و ۲۳ دا مەتنی تەواوی "مەوادی موعاهەدەنامەی بەینی ئینگلیز عیراق تورک کە لە ٥ ی حوزەیرانی ۹۲۶ دا لە ئەنقەرە عەقد کراوە" بڵاو کردۆتەوە.

موعاهەدەکە پێک هاتوە لە پێشەکیەک و ۳ فەسڵ.

لە پێشەکیەکەی دا لایەنەکانی پەیمانەکەی دیاری کردوە کە: مەلیکی بریتانیا و سەرکۆماری تورکیا و مەلیکی عیراقن و، هۆی بەستنی بەمجۆرە رون کردۆتەوە:

"لە بەر ئەمەی مەوادی ئەو موعاهەدەنامەیە کە دائیر بە تەعینی حدودی تورک و عیراقە و لە تاریخی ٢٤ ی تەموزی ۹۲۳ دا لە لۆزان ئیمزا کراوە، هێنرایە بەر مەدی نەزەر و،

لە بەر ئەمەی لە نەتیجەی ئەو موعاهەدانەی کە لە بەینی بریتانیای عوزما و عیراق لە تاریخی ۱۰ ی تشرینی ئەوەلی ۹۲۲ و ۱۳ ی کانونی سانی ۹۲۶ دا عەقد کراوە و، بەم موناسەبەتەوە ئیعتیراف بە ئیستیقلالیەتی عیراق کراوە،

بۆ ئەمەی حوسنی تەفاهوم و حوسنی مەوەدەت لە بەین دا پەیدا ببێ و لە بەر ئەمەی ئارەزوکەش بون کە ببنە مانیعی هەمو نەوعە حادیسەیەک کە لە سەر حدود رو ئەدا، بە عەقدی موعاهەدەیەک قەرار درا و لە تەرەفینەوە مورەخەص تەعین کرا."

فەسلی یەکەم، مادەکانی ۱ ٥ دەربارەی دیاریکردنی خەتی سنورە لە نێوان هەردو وڵات دا. خەتی برۆکسل، کە لە کۆبونەوەی ۲۹ ی تشرینی ئەوەلی ۹۲٤ ی کۆمەڵەی گەلان دا بڕیاری لێ درا بو، کراوە بەم خەتە و، (ئەنجومەنی تەرسیمی حدود) کە تێکەڵاوە لە نوێنەرانی تورکیا و بریتانیا و عیراق لە ماوەی ٦ مانگ دا کۆ ئەبێتەوە.

فەسلی دووەم، مادەکانی ٦ ١٣ دەربارەی ئاسایشی سنورە.

م ٦: لە مەناتیقی موجاویرەی حدود دا، یەک وە یا چەند شەخسێکی موسەلەح بە قەصدی ئیرتیکابی شەقاوەت و راووڕوت ئیحزارات بکەن، موتەعاقیدین، مقاوەمەت و لە تەجاوزی حدود مومانەعەتیان تەعەهود ئەکەن.

م ٧: ئەربابی ئیختیساس، کە لە م ١١ دا بەیان کراوە، ئەگەر بێت و خەبەر بە مەرجەعی خۆی بدات کە لە مەناتیقی موجاویرەی حدود دا لە تەرەف شەخسێک وە یا چەند شەخسێکەوە بە قەصدی شەقاوەت و راووڕوت ئیحزارات ئەکرێ، لازمە ئەو مەرجەعانە بە بێ تەئخیر ئیختاری یەکتری بکەن.

م ٨: ئەربابی ئیختیساس، کە لە م ١١ دا بەیان کراوە، لە هەمو حەرەکاتێکی شەقاوەت و راووڕوت کە لە ئەرازی موختەسەی خۆیان دا رو ئەدا مەرجەعەکانیان زو خەبەردار ئەکەن. ئەو وەختە مەرجەعەکان، بە هەمو نەوعە وەسائیلێ لە تەجاوزی حدود مەنعی مورتەکیبی ئەم حەرەکاتە ئەکات.

م ٩: یەک وە یا چەند شەخسێکی موسەلەح لە مەناتیقی موجاویرەی حدود دا جینایەتێ وە یا جونحەیە ئیرتیکاب بکات و ئیلتیجا بە مەنتیقەی حدودی ئەم لا بکا .. مەنتیقەی دووم ئەم نەوعە کەسانە تەوقیف و بە موجیبی.. لە سیلاح تەجریدی ئەکات و تەسلیم بە حکومەتی مەتبوعەی ئەکات.

م ١٠: مەنتیقەی حدود کە ئەم فەسلی موعاهەدەنامەیەی تێدا تەتبیق ئەکرێ حەدی فاصیلی بەینی تورکیا و عیراقە و داخیلەن ئەو مەنتیقانەیە کە بە هەردو دیوی حدودا لە دوری ٧٥ کیلۆمەترەوە ئیمتیداد ئەکات.

م ١١: ئەو زاتانەی کە ئەم فەسلی موعاهەدەنامەیە تەتبیق ئەکەن ئەمانەن:

لە لایەنی تورکیاوە، قوماندانی عەسکەریەی حدود.

لە تەرەفی عیراقەوە، موتەصەڕیفانی موصل و ئەربیل.

بۆ تەبلیغاتی موستەعجەلە و، بۆ ئیعتای مەعلوماتی محەلیە:

لە تەرەف تورکەکانەوە، بە موافەقەتی ئومەرایانەوە ئەو مەرجەعانەیە کە تەعین ئەکرێن.

وە لە تەرەف عیراقەوە، قائیمقامەکانی زاخۆ، عەمادیە، زیبار و رەواندز.

م ١٢: مەرجەعەکانی تورکیا و عیراق، ئەفراد و رۆئەسای عەشایەر کە لە ئەرازی خۆیدا ساکنە و تەبەعەی حکومەتی ترە، رەسمەن و سیاسەتەن، لە هەمو موخابەرەیە مەنعیان ئەکات و، لە عەلەیهی یەکێ لەم دو حکومەتە لە مەنتیقەی حدود دا مەیدانی کردنی جەمعیات و پروپاغاندە نادات.

م ١٣: لە سەر حدود بە صورەتی عمومی بۆ محافەزەی رابیتەی حوسنی جیوار و بۆ ئاسانی جێبەجێ کردنی ئەم فەسلەی مەعاهەدەنامەیە لە تەرەف حکومەتی تورکیا و عیراقەوە بۆ ئەم مەقصەدە موتەساویەن ئەنجومەنێکی دائیمی حدود تەشکیل ئەکرێ. ئەم ئەنجومەنە بە ئیقتیزای وەخت و زەمانە بە لای کەمیەوە بە ٦ مانگ جارێک وە یا زیاتر کرد ئەبێتەوە. ئەم ئەنجومەنە کە بەعزەن لە تورکیا و بەعزەن لە عیراق کرد ئەبێتەوە ئەو مەسائیلەی کە موتەعەلیقە بە تەتبیقی ئەحکامی ئەم فەسلی موعاهەدەنامەیە و ئەو مەسائیلەی کە لە بەینی مەئمورینی مەنتیقەی حدود و ئەربابی ئیختیساس دا حەلی مومکین نابێ بە صورەتێکی دۆستانە بۆ حەل و فەسلی تێ ئەکۆشێ و هەوڵ ئەدات.

له ئیعتیباری ته‌تبیقی ئه‌م موعاهه‌ده‌نامه‌یه‌وه له زه‌رفی دو مانگ دا بۆ ئه‌وه‌ل جار له زاخۆ گرد ئه‌بنه‌وه.

فه‌سلی سێیه‌م، ماده‌کانی ١٤  ١٨ ئه‌حکامی عامه‌یه ده‌رباره‌ی به‌شی تورکیا له نه‌وتی که‌رکوک دا و رێوشوێنی گۆڕینه‌وه‌ی ده‌قی په‌سندکراوی په‌یمانه‌که.

"ئیمزا و ته‌صدیقی موعاهه‌ده‌که

"جه‌لاله‌تمه‌ئاب مه‌لیکی عیراق موعاهه‌ده‌که‌ی به‌ینی ئینگلیز، عیراق و تورکی ئیمزا کردوه و وه‌کو مه‌علوم بوه مه‌جلیسی مه‌بعوسانی بریتانیا و جه‌لاله‌تمه‌ئاب مه‌لیکی موعه‌زه‌می بریتانیاش ته‌صدیق و ئیمزای کردوه.

"موباده‌له‌ی نوسه‌خی موعاهه‌ده‌که له ئه‌نقه‌ره

"بۆ گۆڕینه‌وه‌ی نوسه‌خی موصه‌ده‌قی موعاهه‌ده‌که که له ته‌ره‌ف جه‌لاله‌تمه‌ئاب مه‌لیکی عیراقه‌وه ئیمزا کراوه یوزباشی سلێمان به‌گ فه‌تاح له به‌غداده‌وه بۆ ئه‌نقه‌ره حه‌ره‌که‌تی کردوه چونکه موباده‌له‌ی نوسه‌خی موصه‌ده‌قه‌ی موعاهه‌ده‌که له ئه‌نقه‌ره ئه‌بێت."(ژیان، ژ ٢٤، ١٥ ی ته‌موزی ١٩٢٦)

"هه‌یئه‌تی دائیمی حدود

"له موقه‌رراراتی موعاهه‌ده‌ی به‌ینی عیراق و بریتانیا و تورکیا ماده‌یه‌ک ئه‌وه‌یه که هه‌مو ٦ مانگێ هه‌یئه‌تی دائیمه‌ی حدود که ئه‌عزاکانی له هه‌ردو حکومه‌تی موته‌جاویره ته‌شه‌کول ئه‌کات له مه‌رکه‌زێکی موعه‌یه‌ن دا ئیجتیماع بکات بۆ روئیه‌تی ئه‌و ئیختیلاف و مه‌سائیله‌ی که له سه‌ر حدود له به‌ینی ته‌ره‌فه‌ین دا رو ئه‌دات.

"ئەم هەیئەتە لە پاش ٣  ٤ رۆژ بۆ ئەوەلجار لە زاخۆ گرد ئەبێتەوە لە تەرەف عیراقەوە لە موتەصەریف و موفەتیشی ئیداری موصل و لە تەرەف تورکیاوە لە وەکیلی قوماندانی حدود و والی حەکاری تەشەکول ئەکات. ئیجتیماعگاهی ئایندەیان لە پاش ئەم ئیجتیماعە تەقەرور ئەکات."(ژیان، ژ ٣٤، ٢٣ ی ئەیلولی ١٩٢٦)

ژ ٣٦:

ژ ٤١: گەیشتنی هەیئەتی حدودی دائیمە بە زاخۆ

ژ ٤٣: لوجنەی حدودی دائیمە گەراونەتەوە جێی خۆیان

ژ ٤٧: موعەلیمی جوغرافیا لە ئیسویچەرە مسیۆ فریتز بیزهیلن بە رەئیسی هەیئەتی تەختیتی حدودی عیراق و تورکیا تەعین کراوە.

ژ ٥٩: مومەسیلی عیراق لە تورکیا

ژ ٦٠: دەستکردن بە دانانی سنوری بەینی تورکیا و عیراق

ژ ٨٣: وەفدی حدودی موصل و تورک ئەوەلی مانگی ئەیلول ئەگەنە بەغداد

ژ ٨٤: هەیئەتی تەحدیدی حدود خاتیمەیان بە ئیشەکەیان هێنا و وەزیفەکەیان تەواو کرد

ژ ٨٨: کۆنسوڵی تورک لە بەغداد

ژ ١٤٢: لیجنەی دائیمی حدود پێنجەمین ئیجتیماع

ژ ١٧٩: لە ماردین کۆبونەوە.

ژ ٢٠٧: لە موصل کۆ ئەبنەوە

ژ ٢٠٨: موزاکەرە بەردەوامە

ژ ٢٠٩: وەفدی تورک گەرانەوە.

## ٢.٣. هەواڵی شۆڕشی کوردەکانی تورکیا

"هەواڵی کوردستانی شیمالی

"لە غەزەتەکانی سوریەوە:

"حەرەکات و ئیختیلالی تازەی کوردستانی شیمالی و وەزعیەتی تورکیا

"لە جێگای موختەلیف حەرەکات و ئیختیلال تازە کراوەتەوە. لە حەوالیی ماردین، موش و بتلیس مەفرەزەکانی کورد کەوتۆتەوە فەعالیەتەوە. سەرکردەی ئەم حەرەکاتە تازەیە لە رونەسای بە ناوی کوردە. لەمانە سمیقۆ (ئیسماعیل ئاغا)، حاجۆ ئاغا، موسا بەگ و براکەی، بەدرخان بەگ و شێخ تاهیر، ئیدارەی ئەم ئیختیلالە ئەکەن. حکومەت ئەم عصیانە زۆر بە ئەهمیەت تەلەقی ئەکا. بینا بە مەعلوماتێکی مەوسوق لە عمومی کوردستانی شیمالیدا حەرەکەتێکی گەورە دێتە وجود. دەربەند و پردەکان لە تەرەف کوردەکانەوە ئیشغال کراوە.

"بەیاناتی وەکیلی داخلیە

"دەرحەق بە حەرەکات و ئیختیلالی تازەی کوردستان وەکیلی داخلیەی تورکیا جەمیل بەگ وتویەتی: ئەم عصیانە زۆر بە ئەهمیەتە فەقەت وەکو وەختێ حکومەت موتەیەقیزە. موحەقەقە کە ئەم ئیختیلالەیش تەسکین ئەکرێ. ئیجاب بە قسەی درێژ ناکا. ئەم ئیختیلالە لە هی ئەوەل موهیمترە.

"ئەسبابی عصیان

"حکومەت ئەم عصیانە ئەخیرەی عەتف کردۆتە سەر ئەو موتەغەلیبانەی کە لە ئیصلاحاتی تازە غەیرە مەمنونن. ئەم عصیانە لە نسێبین و جزیرەی ئیبن عومەرەوە دەستی پێ کراوە و بۆ داخل سیرایەتی کردوە. لە گەڵ ئەمەیشدا حکومەت چونکە لە وەختی خۆیدا لەم حەرەکاتە زو خەبەردار بوە بۆ کوژاندنەوەی ئەم عصیانە قوەتی کافیەی ناردۆتە سەریان.

"موسا بەگ ئەسیر کراوە

"لە روئەسا و سەرکردەی ئیختیلالی کوردستانی شیمالی موسا بەگ لە موصادەمەیەکدا بریندار بوە و ئەسیر کراوە." اژیان، ژ ١٤ ی ٢٩ ی نیسانی ١٩٢۶ا

"تەوەسوعی دائیرەی ئیختیلالی کوردان لـە گۆیـان و وان و هیجرەتـی شێخ عەبدولای قازیی گۆیان بۆ زاخۆ

"غەزەتـەی الموصـل لـە ژێـر ئـەم عینوانـەدا هـەواڵێکی زۆر نـاخۆش و موئەسیری نەشر کردوە کە ئینسان لە نوسین و بیستنی ئەم تەرحە فەجایعە دەستی ئەلەرزێ، مەتەئەسیر ئەبێ و گریـانی دێ. تورکـە خونخوارەکـان لـە زدی کـوردە ئیسـلامەکانی شیمالی قەسـابخانەکەی پاریـان ئیحیـا کردۆتـەوە. قەت ئەبێ دەست لە پیشەی ئەجدادیان هەڵگرن، زیرا ئەمە لە موقتەزای نەبیعەتیانە و بـۆ تـەئیدی خـاترەی جـەنگیزە! ئایـا لـە عالـەمی بەشـەریەت و مەدەنیەت دا کەس حەقی پرسینەوەی ئەمەی نیە؟ کە بلێ ئەم خوێنڕشتنە لە بۆ چیە؟ یان مەحکومە فەنابونی زەعیفە بێ دەستەکان داخلی مەسلەحەتیانە؟

"غەزەتەی مەزکور نوسیوێتی کە: لێشاوی موهاجیرینی کوردەکان لە گۆیان و شیمالەوە بە سورەتێکی متەوالیە خۆیان ئەهاوێژنە حدود. لە میانـەی ئەمانەدا شێخ عەبدولا قازیی گۆیان لە گەڵ چەند پیاوێکی خسوسی خۆی، کە هەمو وەختێ رەفاقـەت و تەبەعیـەتی ئەکـەن، گەیشـتونەتە زاخـۆ. لـە موما ئیلەیهی شێخ عەبدولا وا ریوایەت ئەکرێ وەختێ کە لە جێگای خۆی بوە فتوای داوە و تەوسیەی هەمو کوردە ژێردەستەکانی خۆی و ئەوانـەی کـە مەنسوبی کوردن، کردوە کە بە کەمالی شیدەت موقابەلەی کردەوەی تورکەکان بکەن، کە لە دینی موبینی ئیسلامیەت لایان داوە و، تـەرکی ئـەو دیارەیش بکـەن کـە لە ژێر ئیدارەی تورک دایە و، هیجرەت بکەنـە ئـەو جێگایانـەی کـە ئیحتیرامی شەعائیری ئیسلامێتی تیا ئەکرێ.

"لە سەر ئەمە هەمو کوردەکان قیامیان کردوە و لە گەڵ تورک دا دەستیان کردوە بە شەڕ. چوار هەزار کەس ئەتباعی ئەم زاتە موحتەرەمە، پیاو، ژن، مناڵ، گەیشتونەتە حدودی شیمالیەی عیراق و، لە حکومەت تەلەبی دەخالەت و قبوڵ کردنی ئیستیرحام کردوە. بۆ ئەمەی کە لە خاکی عیراق دا بە کەمالی ئیتمینان بژین و لە دەست زوڵم و غەدری تورکەکان رزگار بن.

"وە ئەڵێن ئەم شێخ عەبدوڵایە کوێرە، فەقەت نفوز و سەتوەتێکی گەورەی بە سەر ئەتباعەکانیا هەیە، کە لە دەرەجەی تەعەبوددا ئیتاعەتی ئەکەن." لژیان، ژ ١٥ ی ٦ ی مایسی ١٩٢٦)

"دائیر بە ئیختیلال و حەرەکاتی کوردستانی سەرو

"لە العراق ەوە

"کوردەکان بە سپەر و ئیستیحکاماتی موکەمەل و قایمەوە دائیرەی ئیختیلالیان تەوسیع و، حەرەکاتی شەڕیان بە سەر ٣ مەنتیقەدا دابەش کردوە. ئەم مەنتیقانە ئەوەلیان ئەرزرۆم، دوەمیان وان و بتلیس، سێیەمیان مەنتیقەی جنوبە.

"زایعاتی تورک

عەشایەری هەرتوش و گەردی لە پاش ئیشغال و گرتنی جولەمێرگ و ئەسیرکردنی والیەکەی شێخ سوتو بەمانە ئیلتیحاق ئەکات. شەمدینان، گەوەڕ و باشقەلعە ئیستیرداد، بەعزێ موهیمات و چەند تۆپێ لە تورکەکان ئەسێنن. فیرقەی سلێمان سەبری بەگ کە بۆ سەر ئەمانە نێررابون پەرش و بڵاویان ئەکەنەوە. قیسمێکیان لێ ئەسیر کردون و قیسمێکیان خۆیان تەسلیم بون. لەم شەڕەدا تورکەکان ٢ هەزاریان زایعات بوە.

"فیرقەی دوانزدەهەمی تورک لە مەعیەتی عوسمان نوری بەگ دایە چوّتە شەرِەوە. کوردەکان ئەمانەشیان محاسەرە کردوە. زۆر موحتەمەلە ئەمانیش بشکێنن و وان بگرن.

"قیامی ئەهالی گۆیان

"لەم خەبەراتی ئاخریەدا کە هاتوە وا دەرئەکەوێ کە: ئەهالی گۆیانیش لە عەلەیهی تورکەکان هەڵساون و شەرِێکیشیان بوە. لەم شەرِەدا گەلێ عەسکەر تەلەف کراوە و گەلێ ئەسیریان لە تورکەکان گرتوە. زایعاتی تورکەکان بە ٨ سەد کەس تەخمین ئەکرێ." ژیان، ژ ٢٠ ی ١٠ ی حوزەیرانی ١٩٢٦)

"گرتنی رەئیسی عەشیرەتی حەسنانلی لە گەڵ ١٦ کەسی رەفیقی

"دیاربەکر: رەئیسی عەشیرەتی حەسنانلی خالید یوسف کە لە پێش قیام و عصیانی شێخ سەعیدی مەرحوم دا لە عەلەیهی تورکیا ئیعلانی عصیانی کرد بو، وە لە وەقعەکەی پاردا قەزای بولانیقی ئیشغال و شەبەیخونی خنسی کرد بو ئەمجارە لە گەڵ ١٦ کەس رەفیقی لە تەرەف مەفرەزەکانی تەعقیبی تورکەوە گیراون." ژیان، ژ ٢٤ ی ١٥ ی تەموزی ١٩٢٦)

"خالید بەگی حەسنانلی

دیاربەکر: خالید بەگی حەسنانلی کە لە قیام و حەرەکاتی میلی کوردستانی شیمالیدا مەدخەلدار بو، وە لە تەرەف تورکەکانەوە گیرا بو، لە نەتیجەی محاکەمەدا کە لە تەرەف مەحکەمەی ئیستیقلالەوە کراوە بە ئیعدام مەحکوم بوە و، حوکمی ئیعدامی ئینفاز بوە."ژیان، ژ ٣١ ی ٢ ی ئەیلولی ١٩٢٦)

"برا کوردەکانی لای سەرو

"مستەفا ئەفەندی مدیری گراوی و مەلا خالیدی موفتی بەیتوشەباب و برایم ئەفەندی تەحصیلداری گۆیان، گۆیا لە پشێوی نزگین ئاغادا دەستیان بوە، لە تەرەف تورکەوە بە ئیعدام مەحکوم کراون. وەکو ئەڵێن کوڕانی

بەدرخان پاشا سەرکردەیی یاخیگەری کوردستانی شیمالی ئەکەن. برایەکی شێخ سەعیدی گەورەی رەحمەتی کە لە دەوری بتلیس بوە ئەویش چۆتە ناو ئەوان. لەم دواییەدا ئەڵێن ئەو برای شێخ سەعیدە کە شێخ ئەورەحمانی ناوە خۆی و پیاوەکانی لە دێیەک دا دەبێ لە ناکاو تورک داویە بە سەریانا و گرتونی خوا بکا درۆ بێ." لژیان، ژ ٥٢ ی ٣ ی شوباتی ١٩٢٧)

"ئیستایش عصیان دەوام ئەکات لە کوردستانی شیمالیدا

دۆغرۆ یۆل: بینا لە سەر ئەو خەبەرانەی کە غەزەتەی ئەزناغ نەشری کردوە، لە ساوجبولاق دا بە تەحریکاتی بۆلشەویکەکان بەعزێ قەبائیلی کورد عصیانی کردوە. هەرچەند لە تەرەف قوەتی ئێرانەوە تەجزیە کراون و قیسمێک لە سەرکردەکانیان گیراون فەقەت هێشتا بە تەواوی تەسکین نەکراوە و عەشیرەتی رەشقوتان هجومی کردۆتە سەر بتلیس و قیسمێکیان ئیشغال کردوە. لە جەبهەی دەرسیمەوە وەزعیەت لە لەهی کوردەکانە لە ئەترافی پالو دا هەیەجانێکی عەزیم هەیە، عەشائیری خنس و رەئیسەکانی زازا موتەفیقەن هجومیان کردۆتە سەر ئەرزرۆم و، قوەتی زۆری کوردەکان لە لای ئارارتەوە تەحەصونی کردوە. عوسمان نوری پاشای فیرقە قوماندانی تورک بە خۆی و قوەتەکەیەوە مەغلوب و ریجعەتی پێ کراوە و لە لایەکی ترەوە کوردەکان شاری بایەزیدیان گرتوە، لە دوای تالان کردن تەخلیەیان کردوە و لەم شەڕانەدا دو تەیارەی تورک سقوتی کردوە و گەلێ عەسکەریان ئەسیر کردوە." لژیان، ژ ٩٠ ی ١٥ ی تشرینی سانی ١٩٢٧)

"جەمعیەتی نەهزەی کوردی لە شام

"العالم العربی: جەمعیەتی نەهزەی کورد لە شام بە ناوی (کوردستان تەعالی جەمعیەتەوە) ئیحتیجاجێکیان کردوە موقابیل بە حکومەتی عیراق لە سەر ئەوەی کە زەینەلعابدین بەگی لە موعەلیمێتی عەزل کردوە." لژیان، ژ ٩٢ ی ٢٩ ی تشرینی سانی ١٩٢٧)

"کوردستانی شیمالی و ئیدارەی مەخصوصە

"لە جەرائیدی پۆستەی ئەخیردا وا دەرئەکەوێ کە حکومەتی تورکیا سیاسەتی خۆی لە خسوس ئیدارەی کوردستانی... گۆڕی بێ.

"وەک مەجەلەی (شرق ادنی) ئەنوسێ حکومەتی تورکیا ولایەتی: مەعمورەتولعەزیز، ئورفە، بتلیس، حەکاری، دیاربەکر، سعرد، ماردین و وانی کردوە بە (موفەتیشیەتێکی عامە) و موفەتیشێکی عام کە لە پایەی (نائیبەلحکومە) دایە ئیدارەی ئەم مەنتیقەیە ئەکات. موفەتیشی مەزکور هەیئەتێکی ئیستیشاریەشی ئەبێ کە عیبارەتە لە معاونی موفەتیش و موستەشاری عەدلی، موستەشاری مالی، موستەشاری عەسکەری، موستەشاری ئیقتیسادی، موستەشاری مەعاریف و موستەشاری سیحی، جگە لەمانە مودیریەتێکی عمومی ئیستیخباراتیشی ئەبێ.

"دیسان بە پێی نوسینی موجەلەی مەزکور ئەم موفەتیشە عامە سەلاحیەتێکی فەوقەلعادەی هەیە:

١. موفەتیشی عام عیندەلحاجە هەمو قوەی ژاندارمە و عەسکەری مەنتیقەی خۆی ئەتوانێ ئیستیعمال بکات.

٢. موفەتیشی عام سەلاحیەتی نەزارەتی ئەمنیەت و ئاسایشی عامی هەیە.

٣. موفەتیشی عام ئەتوانێ تەتبیقی هەمو نەوعە مەشروعێک بکا کە پێویست بێ بۆ تەرەقی ئیقتیسادی، سیحی، ئیجتیماعی عەسری و مەدەنی و، ئەبێ ئیدارەیەکی موکەمەل و مونتەزەم دابمەزرێنێ و نەزارەتی ئینتیزام و تەرتیبی ئەم ئیدارەیە بکات.

٤. موفەتیشی عام حوریەتی شەخسی ئەهالی ئەو مەنتیقەیە تەئمین و محافەزەی ئەحوالیان ئەکات.

"لە بەعزێ مەوادی ئەم ئەحوالی ئیدارەیە وا دەرئەکەوێ کە حکومەتی تورکیا سیاسەتی جەبر و شیدەتی نەختێ کەم کردبێتەوە، لە جیاتی ئەحوالێکی مولایم و موافیقی رۆحی میلەت تەنزیم بکات. لە سەر ئێمە لازمە دوعا بکەین ئەگەر تورکیا بو سوئی قەسد کردبێتی خوا بۆ برا کوردەکانمان بیگێڕێ بە حوسنی قەسد." ژیان، ژ ٩٦ ی ٣ ی کانونی سانی ١٩٢٨)

"کۆلۆنێل لۆرەنس

"ئیستانبول: غەزەتەکانی تورک ئەنوسن کە واسیتەی ئینقیلابی ئەفغان کۆلۆنێل لۆرەنس بوە، وەکو ساڵی ١٩١٥ لە عەرەبستانا و لە ساڵی ٩٢٥ دا لە کوردستانی شیمالیدا لە عەلەیهی تورکیا ئەم ئینقیلابەی کرد، بەلام غەزەتەکانی خاریجی تورکیا تەکزیبی ئەکەن و، حەقیقەتەن لە مەسئەلەی کوردستانا هیچ عەلاقەیەکی نەبوە." ژیان، ژ ١٦٠ ی ١١ ی مارتی ١٩٢٩)

"جیابونەوەی کوردەکان لە تورکیا

"ئیستانبول: وەکو لە ولایەتەکانی شەرقەوە خەبەر وەرگیراوە لە بەر ئەوەی دیسانەوە بەعزێ لە کوردەکان فکری جیابونەوەیان لە تورکیا کەوتۆتە سەر، حکومەت بۆ مەنعی ئەم حاڵە خەریکی تەدابیرە کە قیسمێک لە کوردەکان نەقل بکات بۆ مەناتیقێکی غەیری کوردستان و بەم نەوعە ئەم فکرەیان مەحو بکاتەوە و حەتا دەستی کردوە بە تەتبیقی ئەم پرۆغرامەی." ژیان، ژ ٢٠٤ ی ١٤ ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٩)

"لە بەینی حدودی سوریە و تورکیادا ٤٠ کەس کوژراوە

"سوریە: وەکو لە حەلەبەوە خەبەر وەرگیراوە ٥٠ ئەشقیای موسەلەح و موجەهەز لە تورکیاوە تێپەڕی حدودی سوریەیان کردوە و تاقمێک لە عەشائیری عەنەزە موقابەلەیان کردوە لە دوای شەڕێکی گەورە ٤٠ کەس لە

ئەشقیاکان ئەکوژرێ و لە عەرەبەکانی عەنەزەیش چەند کەسێک برینـدار بون." (ژیان، ژ ۲۰۶ ی ۲۱ تشرینی یەکەمی ۱۹۲۹)

"ئۆردویەکی دەهەزار مەسی تورک

"تـەهران، هـاوار بـڵاو بۆتـەوە کـە ئۆردویـەکی دو هـەزار عەسـکەری تورک لە گەڵ کوردەکانا لە شاخی ئەراراتا لە شەڕ کردنایە." (ژیان، ژ ۲٤۸، ۳۰ حوزەیرانی ۱۹۳۰)

"سەورەی کوردستان

"تـەهران: مـەحافیلی عەسـکەری ئـێران زۆر ئەهمیـەت ئـەدات بـە سەورەی کوردەکانی شیمال و، هەمو قوەتەکانی حدودی تەقویە کردوە و بە تۆپـی گـەورە و مـەترالیۆز تەقویـەی کـردون و ئـەڵێن ئـێران ئەیـەوێ لـەم خسوسەوە موعاوەنەتی تورکەکان بکات." (ژیان، ژ ۲٥۱ ی ۱٤ ی تەموزی ۱۹۳۰)

"هەواڵی دەرەوە:

"کوردستانی شیمالی

"ئەنقەرە: وەکو مەعلوم بوە سەورەی ئەمجارەی کوردەکانی شیمال وەکو پێشو نیە، حەرەکەتێکی غایەت مونتەزەم و رێکوپێکە.

"کوردەکان بە عمومی تـابیعی قوماندانێکی عمومین کە نـاوی جەنرال عوسمان نوری‌یە (راستەکەی ئیحسان نوری‌یە) قوەتەکەیان مونتەزەم بە چەند غروپێک تەقسم کردوە. هەر غروپێک قوماندانی خاسی خۆی هەیە و هـەمو تـابیعی قومـاندانی عمومـین. تەشـکیلاتی تـۆپ و مـەترالیۆزیان هەیـە. شوعبەیەکی گەورەی ئیستیخباراتیان هەیە. ئەو مەناتیقە کە ئیستیلایان کردوە بۆ هەمو شوێنێکی مەئمورینی ئیدارەیان بۆ تەشکیل کردوە.

"ئەنقەرە: خەبەری ئەمجارە ئەڵێ لە لایەکەوە هەرچەند قوەی تورک کوردەکانی شکاندوە و هەتا گۆلی وان و مەنتیقەی ماکۆ تەعقیبی کردون، بەلأم لە جێگایەکی ترا لە بەینی قوەی تورک و کوردەکانا موحارەبەیەکی زۆر بە شیدەت بوە و شەوێک هەتا بەیانی دەوامی کردوە. نەتیجە کوردەکان لەو موحارەبەیەدا تورکەکانیان مەغلوب کردوە و مەنتیقەی چاڵدێرانیان بە تەواوی ئیستیلا کردوە.

"رۆژێ لە دوای ئەم شەڕە، لە ١٥ مانگ دا قوەتێکی زۆر گەورەی کوردەکان هجومیان کردۆتە سەر قەزای (ئاغدیر) لە پڕا شارەکەیان گرتوە. چونەتە سەر قائیمقام، مەئمورینی حکومەت و هەمو ژاندارمە... مەنتیقەیان گرتوە و ئەسیریان کردون. وە هەرچی ئەشیای حکومەت هەیە تالأنیان کردوە و عمومی خەتی تەلغراف و تەلەفۆنیان پچڕانوە.

"دەستبەجێ بە ناو شار و دێهات و عمومی قەزاکانا ئیعلانیان بلأو کردۆتەوە نوسیویانە: ائەی کورد! خۆتان کۆ بکەنەوە وا ئۆردوی نەجاتدەرتان بۆ هات. پشتیوانی خوا ئیتر لە ژێر باری زوڵمی تورکا دێنە دەرەوە و مەملەکەتەکانمان کە وەتەنێکی ئەبەدی و خۆشەویستی خۆمان کوردانە لە دەست ئەم میلەتە حەقیقەت نەناسە نەجات ئەدەین!

"عمومی غەزەتەچیەکانی تورک نوسیویانە ئۆردوی کورد لە مەناتیقی مجاویرەوە ئەرزاق و ئەشیایان بۆ دێ. تورکەکان قەراریان داوە ئیتر سیاسەتی ئیمحا تەعقیب بکەن و دەستیان کردوە بە دێهات و مەزرەعە سوتانن. لە سەر ئەمەیش کوردەکان گوێیان نەداوەتێ لەو مەناتیقەشەوە کە ئۆردوی تورکی تیایە دیسانەوە ئەهالیەکە هەڕا ئەکەن و ئەچنە ناو ئۆردوەکەی خۆیان کوردەکان.

"تورکیا تەلەبی معاوەنەتی لە روسیا و ئێران کردوە

"ئەنقەرە: حکومەتی تورکیا هەتاکو ئیستا چەند موزەکەرەیەکی داوە بە ئێران و روسیا تەلەبی معاوەنەتی لێ کردون. حکومەتی ئێران هێشتا جوابی نەداوەتەوە، بەڵام حکومەتی روسیە جوابی داوەتەوە و گوتویەتی قەتعیەن معاوەنەتی کوردەکان ناکەم وو ئەڵێچن لە حدودا عەسکەری داناوە کە کوردەکان تەجاوزی ئەرازی روسیا نەکەن.

"عمومی عەشائیرەکانی کورد لە مەنتیقەی شیمالی ئازەربایجان دا رۆیشتون و ئیلتیحاقیان بە ئۆردوەکانی کورد کردوە.

"زوڵمی تورک

"لە سەر ئەمری قوماندانی عمومی تورک ئۆردوەکانی تورکیا بە هەر جێگایەک دا رۆیشتبن وەلەو چۆڵیش بوبێ دێهاتەکانی کوردیان سوتانوە و بەعزێ ئەهالیان کوشتوە کە دەخلیان نەبوە بە سەر ئەم حەرەکاتەوە.

"ئەڵێن: هەتاکو ئیستا بە ناحەق ۲٤٠ دێیان سوتانەو و ٤٥- کەسیان کوشتوە بە بێ ئەوەی لە شەڕا بوبن.

"قیسمێک لە پیاوە گەورەکانی تورک لە ناو کوردەکان

"ئەنقەرە: ئەڵێن لە قوماندان و پیاوە گەورەکانی تورک، ئەوانەی لە جمهوریەتی تورک نەفرەت ئەکەن، چونە ناو کوردەکانەوە و معاوەنەتیان ئەکەن و حەتا ئەڵێن پرنس عەبدولقادر کوڕی سوڵتان عەبدولحەمید خانیش چۆتە ناویان. بەڵام بە تەواوی ئەم خەبەرە مەعلوم نەبوە.

"تورکیا ئێران مەسئول ئەکات

"ئیستانبول: عیسمەت پاشای رەئیسی حکومەتی تورکیا گوتویەتی لە مەسئەلەی هەرای کوردەکان و ئێمەدا ئێران مەسئولە چونکی لە محافەزەی حدودا ئیهمالی کردوە.

"دو تەیارەی تورک سقوتی کردوە

"ئەناتۆل: قیسمێک تەیارەی تورک ئەچنە سەر کوردەکان قەرارگاکەیان بۆمباردومان ئەکات و لە تەیارەکان دوانیان سقوتی پێ ئەکەن. راسید و تەیارەچیەکان ئەگرن. قوماندانی عومومی ئۆردوی کورد جەنەراڵ عوسمان نوری ئەیان باتە لای خۆی. پێیان ئەڵێ ئەو خەبەرە درۆیانەی کە تورکیا نەشری ئەکات هەموی درۆیە. کوردەکان هێشتا ئەزیەتێکی ئەسیرەکانی تورکیای نەداوە و، درۆیی کە ئەنوسن کوردەکان لوت و گوێچکەی ئەسیرەکانی تورکیان بڕیوە.

"بۆ ئەوەی ئەم خەبەرە بگێڕنەوە و بە درۆی بخەنەوە تەیارەچیەکان بەرەڵا ئەکات.

"مەنتیقەی بایەزید و وان

"ئەنقەرە: تورکەکان قوەتێکی زۆریان سەوق کردوە بۆ ئەترافی وان و بایەزید و ئەرزنجان بۆ ئەوەی لەشکر و ئۆردوی کوردەکان لەو ناوەدا دور بخاتەوە." ژیان، ژ ٢٥٦ ی ٧ ی ئاغستۆسی ١٩٣٠)

"سەورەی کوردستانی شیمالی

"ئیستانبول: بە سەبەبی ئەو حەرەکاتەی کە تورکەکان لە سەر شاخی ئارارات کردویانە کوردەکان ئیمدادیان بۆ ناچێ و لە مقاوەمەت عاجز بون لە بەر ئەوە مەجبور بون تەسلیمی ئۆردوی تورک ببن.

"سەرەڕای ئەمەش لە بەینی عەشائیرە کوردەکانیشا ومزعیەت تێک چوە و ئەکسەریان لە عەلەیهی ئەمەن کە ئیتر شەڕ لە گەڵ تورک دا بکەن."

ژیان، ژ ٢٦٠ ی ٢٢ ی ئەیلولی ١٩٣٠)

"ئیحسان نوری دەردەست کراوە

"خەبەر وا دراوە کە لە روئەسای عەشایەری ولایاتی شەرقیە کە لە ئەسنای حەرەکاتی ئاغری داغ دا فیراریان کرد بو ئیحسان نوری و عەبدولقادر لە تەرەف ئێرانەوە دەردەست و سەوقی تەهران کراون." (ژیان، ژ ٢٦٦ ی ١ ی کانونی سانی ١٩٣٠ (بە هەڵە ١٩٣٠ نوسراوە راستەکەی ١٩٣١ ە)

"تێکچونی عەلاقاتی ئێران و تورکیا

"ئیستانبول: لە ئەنقەرەوە خەبەر هاتوە کە دەوائیری حکومەت پرۆتیستۆی بەردانی زوعەمای کوردی کردوە موقابیل بە ئێران و تەخلیەی سەبیلی ئەمانەی بە معامەلەیەکی دوشمنایەتی عەد کردوە ئەم ئیشە بۆتە باعیسی تێکچونی عەلاقاتی بەینی ئێران و تورکیا دوبارە و رەسمەن ئیعلان کراوە وەزیری حەربیە ئیصداری تەعلیماتی بۆ قیوای حدود کردوە بۆ قەمعی کولی محاوەلەیەک کە لە تەرەف کوردەکانەوە بۆ تەجاوزی حدود و تەعقیبیان لە حینی لزوم دا هەتا داخلی ئەرازی ئێران." (ژیان، ژ ٢٦٧ ی ٨ ی کانونی سانی ١٩٣١)

"حدودی ئێران و تورکیا

"تەهران: سەردار ئینتیصار رەئیسی لیجنەی حدود گەڕایەوە تەهران و دو راپۆری موفەصەلی تەقدیمی وەزارەتی خاریجیە و حەربیە کردوە. وا دەرئەکەوێ کە مەحافیلی عەسکەریەی ئێران ئەو میقدارە ئەرازیەی کە حکومەتی تورکیا موقابیل بە ئەرازی شاخی ئارارات ئەیەوێت بیدا بە ئێران بە کافی نازانن. عەلاوەتەن بەعزێ لەم مەحافیلانە لە نوقتەی نەزەری عەسکەریەوە و بۆ محافەزەی ئێران شاخی ئارارت زۆر بە لازم ئەزانن بۆ ئێران." (ژیان، ژ ٢٦٨ ی ١٥ ی کانونی سانی ١٩٣١)

## ٣. هەواڵەکانی ئێران

ژیان بایەخێکی تایبەتی داوە بە نوسینی هەواڵەکانی ئێران. ئێران تا چەند ساڵێ بە رەسمی دانی نەئەنا بە حکومەتی عیراق دا و، پێوەندی دیپلۆماسی لە گەڵ دروست نەئەکرد.

پیرۆزگاکانی شیعە: نەجەف و کەربەلا و کازیمەین و سامەرا، کەوتونەتە ناو عیراقەوە، کە هەمو ساڵ هەزاران ئێرانی بۆ زیارەتیان ئەهاتن.

ناکۆکیەکانی سنور، بە تایبەتی شەتولعەرەب، کە بە میرات لە سەردەمی عوسمانی‌یەوە مابوەوە هێشتا بە لادا نەکەوتبو.

لەو سەردەمەدا هەزاران هاووڵاتی ئێرانی نیشتەجێی عیراق بون. کار و پیشەیان هەبوە.

لە ناو ئەو هەواڵانەدا کە ژیان بایەخی پێ داون، چەند بابەتێکن، لەوانە:

### ٣. ١. پێشکەوتنی ئێران لە سایەی رەزا شادا

شەمەنەفەر

"حکومەتی ئێران خلیجی فارس بە تەهرانەوە رەبت ئەکات

"لۆندرە، لە خەبەراتی پاریسەوە: کە موخابیری دەیلی ئێکسپرێس لە جنوەوە بۆ غەزەتەکەی نوسیوە ئەڵێ هەیئەتێکی فەنی کە لە موهەندیسینی ئینگلیز، ئامریقا و ئیسویچەرەیی مورەکەبە، لە زۆریخەوە بۆ ئێران حەرەکەتی کردوە بۆ تەماشاکردنی مەسئەلەی تەمدیدی رێگای ئاسنی ئێران کە لە شیمالەوە بۆ جنوب ئینشا ئەکرێ و خلیجی فارس بە تەهران رەبت ئەکات. بۆ دروستکردنی ئەم خەتە نزیکی ٧ ملیۆن لیرەی ئینگلیزی مەسرەف تەخمین کراوە."(ژ ٣٧، ١٥ ی تشرینی ئەوەڵی ١٩٢٦)

"رێگای ئاسن لە ئێران

"ئالات و ئەسبابێ کە بۆ راکێشانی خەریتەی ئەو شوێنان کـە رێگـای ئاسنی تیا رائەکێشرێت بە کەڵک دێ بە وەزارەتی ئەشغال و مواسەلاتی ئێران گەیشتوە."ژیان، ژ ٥٣، ١٠ ی شوباتی ١٩٢٧)

"شەمەندوفەری ئێران

"حکومـەتی ئـێران بـۆ ئـەو ١٢٠٠ میـل شـەمەندوفەرەی کـە لـە خلیجـی فارسەوە بۆ بەحری قەزوین ئەیکات عمومی کرینی مالەزمەیەکی ئەم خەتەی لە ئەوروپادا خستۆتە موناقەسەوە."ژیان، ژ ١٠٧، ٢٢ ی مارتی ١٩٢٨)

"ئەو خەتی شەمەندوفەرەی کە ئێران لە خلیجی فارسەوە بە تـەهرانا بـۆ بـەحری قـەزوین رای ئەکێشـێ لـە نەتیجـەی موناقەسـەدا قیسـمێکی شیرکەتێکی ئـەڵمان و قیسـمێکی کـەی شـیرکەتێکی ئەمـەریقا دمر عوهدەیـان کردوە کە پیٚیان بفرۆشێ."ژیان، ژ ١٠٩، ١٢ ی نیسانی ١٩٢٨)

"شەمەندوفەری ئێران

"حکومەتی ئێران بۆ ئـەو شـەمەندوفەرەی کـە لە بەحری فارسەوە بـۆ بەحری قـەزوین رای ئەکێشێ قیسمی جنوبی داوە بە شیرکەتەکانی ئامریقا، فرانسە و ئینگلیز، لای شیمالیشی داوە بـە شـیرکەتەکانی ئـەڵمانیا."ژیـان، ژ ١١٣، ١٠ ی مایسی ١٩٢٨)

"شاهی ئێران لە عەبادانا

"عەبادان، رەزا خان شاهی ئێران مواسەلەتی عەبادانی فـەرموە و بـە سورەتێکی موحتەشـەم ئیسـتیقبالی فـەرموراوە و شـیرکەتی نـەوتی ئینگلیز و فـارس دەعوەتێکـی مونتـەزەمی بـۆ کـردوە لـە حەفلـەی ئینشـا کردنـی شەمەندوفەرەکەدا شاه بە دەستی خۆی ئەوەل بەردی داناوە."ژیان، ژ ١٣٦، ١٢ ی تشرینی دووەمی ١٩٢٨)

ڕێگەی ئاسمانی

"ڕێگای هەوائی لە بەینی مەشهەد و موحەمەرەدا

"شیرکەتی تەیارەی جنکرس لە ئێران دەستی کردوە بە تەجرەبە بۆ ئەوەی کە بیلێتخەرە لە بەینی مەشهەد و موحەمەرە و تەهرانا پۆستە بەرێ و لە تەجرەبەکەیا موەفەق بوە."(ژیان، ژ ٩٥، ٢٧ ی کانونی ئەوەلی ١٩٢٧)

بێتەل

"بێ تەلی ئێران

"موحەمەرە، حکومەتی ئێران لە هەمو مەمالیکی جنوبیەیدا ئیستاسیۆنی بێتەلی تەئسیس کردوە."(ژیان، ژ ١٤٩، ٧ ی کانونی سانی ١٩٢٩)

"موخابەرە لە بەینی تەهران و ئەنقەرەدا

"تەهران، لە بەر ئەمە لە تەجرەبەی موخابەرەی بێتەل لە بەینی ئەنقەرە و تەهرانا موەفەقیەت ئیحراز کراوە مودیریەتی عامی پۆستە و تەلغرافی ئێران ئیعلانی کردوە کە لەمەودوا بۆ ئەنقەرە تەلغراف وەرئەگیرێ."(ژیان، ژ ١٠٢، ١٦ ی شوباتی ١٩٢٨)

"بێتەلی ئێران

"تەهران، ٨ ئیستاسیۆنی بێتەل لە قیسمێک لە مەملەکەتەکانی ئێرانا دانراوە و ئیدارەی ئەم ئیستاسیۆنانە بە دەست موتەخەسیسینی فرانسە و ئەڵمانەوەیە. حکومەتی ئێران خەریکە ٩ ئیستاسیۆنی بێتەلی تر لە حدودەکانا دابنێ."(ژیان، ژ ٢٣٤، ١٠ ی نیسانی ١٩٣٠)

دەرهێنان و دەرامەتی نەوت

"نەوتەکانی ئێران

"جیهەتی عائیدیەتی کانی نەوتەکانی ئێران حەوالی (سەمغان) کە لە مەسافەی ١٥٠ میل لە شەرقی تەهران دا واقیعە کەوتۆتە مونازەعەوە. قۆمپانیەی (ئانغلۆ پێرسیان ئۆیەل) ئیدیعا ئەکات کە ئەم ساحەیە داخلی ئەو

ئیمتیازەیە کە لە ساڵی ١٩٠١ دا وەری گرتوە، لە لایەکی ترەوە کابرایەکی ئێرانی ئیدیعای کردوە کە مەنابیعی ئەم حەوالیە بە پێی فەرمانێک پێی بەخشراوە، لە لایەکی تریشەوە (سۆڤێت بانق) لە تەهران دا بۆ بە عەمەل هێنانی ئەم کانانە سەرمایەی داناوە."(ژیان، ژ ٣٨، ٢١ ی تشرینی ئەوەلی ١٩٢٦)

"واریداتی حکومەتی ئێران لە کانەکانی نەوتی خواروە

"واریداتی حکومەتی ئێران لە کانەکانی نەوتی خوارو لە زەرفی ١٣ ساڵ دا یەعنی لە ١٩١٣ەوە تا ١٩٢٦ گەیشتوّتە پێنج ملیۆن و نیو لیرەی ئینگلیزی."(ژیان، ژ ٥٣، ١٠ ی شوباتی ١٩٢٧)

"شیرکەتی نەوتی فارس

"وەکو خەبەر زانراوە ئەمجارە لە نەتیجەی حەفریاتا کە شیرکەتی نەوتی ئینگلیز و فارس لای ئەهوازەوە کردویەتی مەنبەعێکی نەوتی دۆزیوەتەوە کە رۆژی ٦٠ تەنی لێ ئیخراج ئەکرێ."(ژیان، ژ ١١٠، ١٩ ی نیسانی ١٩٢٨)

"حیصەی ئێران لە نەوت دا

"تەهران، حکومەتی ئێران لە ساڵی ٩٢٩ دا --،١,٢٥٠ لیرەی ئینگلیزی لە شیرکەتی نەوتی (ئینگلیز و ئێرانی) چنگ کەوتوە."(ژیان، ژ ٢٢٠، ٣٠ ی کانونی ئەوەلی ١٩٢٩)

کارەبا

"ئەلەکتریق لە تەهران

"بەلەدیەی تەهران قەراری داوە کە بەعزێ لە جادەکان بە ئەلەکتریق تەنویر بکات و بۆ ئەمە خەریکی کڕینی دو مۆتۆڕی گەورە و بە قوەتە."(ژیان، ژ ٩١، ٢٢ ی تشرینی دوەمی ١٩٢٧)

پیشەسازی

"فابریقەی شخارتە لە تەورێز

"حکومەت ئەو ئەسباب و لەوازیماتەی کە بە ناوی فابریقەی شخارتەی تەورێزەوە ئەهێنرێتە ئێران تا ٣ ساڵ لە رسومی گومرگی عەفوی کردوە. ئەمەیش لە رێی ئیدخال و دامەزراندنی مەعامیل و سائیرەدا لە ئێران نەوعە تەشویق و معاوەنەتێکە."(ژ ٣٨، ٢١ ی تشرینی ئەوەلی ١٩٢٦)

"فابریقەی شەکر لە ئێرانا

"حکومەتی ئێران خوریکە لە ئەرازی ئێرانا فابریقەیەکی شەکر تەئسیس بکات. بۆ ئەمە ئیتیفاقی لە گەڵ شیرکەتێکی چیکۆسلافاییدا کردوە کە موتەخەسیس بنێرێ تەماشای وەزعیەتی ئێران بکات بزانێ ئایا ئەرازییەکەی بە عەمەلی زوراعەتی چەوەندەر دێ. وە ئەو شەکرەی کە لە ئێرانا دروست ئەکرێ لە شەکری خاریجی هەرزانتر ئەکەوێ."(ژیان، ژ ١٥٧، ٢١ ی شوباتی ١٩٢٩)

هەواڵی دارایی

"مالیەی ئێران

"لە تەرەف حکومەتی ئێرانەوە مودیری بانکی ئیسویچەرە تەعین کراوە بە مودیری عامی خەزینەی ئێران و لەم مانگەدا موباشەرەت بە ئیش ئەکات."(ژیان، ژ ١١٣، ١٠ ی مایسی ١٩٢٨)

"ئێران روپیە مەنع ئەکات

تەهران، حکومەتی ئێران ئەمری داوە بە عمومی موەزەفینی حدود و مەئمورینی پۆستە کە موافیقی قانونێکی موسەدەق لە تەرەف مەجلیسی مەبعوسانەوە مەنعی روپیە بکەن کە داخلی تەهران ببێ."

"فەرعی بانقی وەتەنی ئێران

"بەغداد، بانقی وەتەنی ئێران کە مودەتێکە حکومەتی ئێران لە ریاسەتی موتەخەسیسینی ئەڵمانیادا لە تەهران و بەعزێ مەملەکەتی تریا کردویەتیەوە، خەریکە لە بەر کوسرەتی عەلاقەی ئیجارەتی ئێران بە عیراقەوە و هی عیراق بە ئێرانەوە، لە بەغدادا فەرعێکی بکاتەوە."(ژیان، ژ ٢٣٠، ١٠ ی مارتی ١٩٣٠)

"ئێران ٣ ساڵ ویرکو لە کوردەکان ناسێنێ

"تەهران، حکومەتی ئێران قەراری داوە لە بەر بەعزێ فەلاکەت و نەبونی کە بە سەریانا هاتوە هەتا ٣ ساڵ ویرکوی قیسمی کوردەواری ئێران تەئجیل بکات."(ژیان، ژ ١٩٠، ٥ ی ئاغستۆسی ١٩٢٩)

## ٣. ٢. کێشەی ناوخۆ

پیلانگێڕان لە شا

"سوئی قەسد

"لۆندرە، بینا بە خەبەراتێ کە لە تەهرانەوە هاتوە: بە فکر و قەسدی کوشتنی جەلالەتی شاهی ئێران رەزا خانی پەهلەوی جەمعیەتێ کە لە تەهران تەشەکولی کردوە کەشف کراوە لە پیاوە گەورەکانی تەهران ئەمری تەوقیف و گرتنی ١٣ کەس دراوە کە ٩ یان زابیتن."(ژ ٣٧، ١٥ ی تشرینی ئەولی ١٩٢٦)

پشێوی و یاخی بونی عەشائیر

"دائیر بە ئیختیلالی ئێران

"لۆندرە ١٣ ی تەموز، لە خەبەراتی تەهرانەوەیە: کە وەزارەتی حەربیەی ئێران دائیر بە ئیختیلالی ئازربایجان و خوراسان تەبلیغێکی رەسمیی بڵاو کردۆتەوە لەمەودوا وەهای بەیان کردوە کە ٦٥ کەس لە ئیختیلالچیەکان ئیعدام کراوە و بەم نەوعە ئەمنیەت و ئاسایش ئیعادە کراوەتەوە."(ژ ٢٦، ٢٩ ی تەموزی ١٩٢٦)

"جەلالەتی شاهی ئێران

"لۆندرە، تەلغرافێکی تەهران وەها بەیان ئەکات کە جەلالەتی شاهی ئێران رەزا خانی پەهلەوی لە خوراسان گەڕاوەتەوە مەقسەدی لەم سەفەرە ئەوە بو کە تەتبیبی خاتری گەورەکانی ئەوێ بکات و لە ئەحوالی ئەو ناوە نوبزەیەک تێ بگات. لە بەر ئەوەی کە قوماندانی عومومی ئۆردوی شەرقی لە گەڵ ئەهالیدا معامەلەی موستەبیدانە بوە و دڵی میلەتی رەنجیدە کرد بو روتبەکەی لێ ئەسێنێتەوە و ئەمر بە حەبسی ئەکات." (ژ ۳۱، ۲ ی ئەیلولی ۱۹۲۶)

"بەربونی قوماندانی ئۆردوی شەرقی ئێران

"تەهران، قوماندانی عومومی ئۆردوی شەرقی ئێران کە نوسی بومان جەلالەتی شاه لە ئەسنای زیارەتی خوراسان دا کە ئیختیلالی عەسکەری تیا پەیدا بو بو لە بەر بەعزێ ئەسباب ئەمری بە حەبس کردنی دابو بەرەڵا کراوە. مەجلیسی نیابی ئێران لە ئیجتیماعێکی سرِیدا قەراریان داوە کە ئیعتیماد بە وەزارەتی تازەی ئێران بکرێ." (ژ ۳۳، ۱۶ ی ئەیلولی ۱۹۲۶)

"بۆ ئیعادەی شاهی لە ئێران

"موخابیری غەزەتەی (دەیلی ئیکسپرێس) لە ئەلائابادەوە نوسیویەتی بینا بە خەبەرێ کە لە تەهرانەوە هاتوە مامی شاهی مەخلوع پرنس سالار ئەلدەولە ئارەزوی سەندنەوەی تەختی شاهی ئێرانی هەیە. بۆ ئەم فکرە عەشائیر و قەبائیلی گەورە و بە قوەتی کوردستان معاوەنەتی ئەکەن. حکومەتی ئێران بۆ دەفع و تەنکیلیان قوەتێکی گەورەی ناردوە. بینا بە هەواڵی مەشهەد عەلی رودانی ئیختیلالێک موحتەمەلە. حاکمی بامبور محەمەد خان لە بەر ئەمەی کە پێی زانیوە قوەتی شاه زەعیفە بۆ ئیحتیلالی دوزداب قوەتی ناردوە.

"پرنس سالار ئەلدەولە تەقریبەن ٤٤ ساڵەیە. لە بەر ئەمەی دائیمەن حەز بە ئیختیلال و شۆڕش ئەکا لە ساڵی ۱۹۰۹ دا لە ئێران نەفی کرا هەرچەند لە ساڵی ۱۹۱۱ دا گەڕاوەتەوە ئێران فەقەت لە بەر ئەمە دیسان ناڕەحەتی و ئیدیعای حاکمیەتی غەربی ئێرانی کرد نەفی کرایەوە. لە ۱۹۲٤ دا لە سەر موساعەدەی حکومەت گەڕاوەتەوە ئێران. "(ژ ۳۵، ۳۰ ی ئەیلولی ۱۹۲۶)

"سالار ئەلدەولە لە بەغدایە

"ئیختیلالگەری مەشهوری ئێران مامی شاهی پێشو سالار ئەلدەولە لە هەولێر گیراوە. حکومەت جەلبی کردۆتە بەغدا فەقەت هێشتا بە تەواوی مەعلوم نەبوە کە حکومەت دەرحەق بە موما ئیلەیهی چ نەوعە معامەلەیەک ئەکات. "(ژیان، ژ ٤٣، ۲۵ ی تشرینی سانی ۱۹۲۶)

"ئیسماعیل خان (سمکۆ)

"بینا لە سەر خەبەراتی هەولێر: ئیسماعیل خان بە ناو (سمکۆ) ئیلتیجای بە حکومەتی عیراق کردوە و حکومەتیش دەخالەتی لێ قبوڵ کردوە. "(ژیان، ژ ٤٣، ۲۵ ی تشرینی سانی ۱۹۲۶)

"مەسئەلەی شاپقە

"تەهران، لە بەعزێ ولایەتی ئێرانا لە عەلەیهی لە سەرکردنی شاپقە و لە بەرکردنی ئەلبیسەی پەهلەوی زۆر ئیغتیشاش وقوعی بوە فەقەت بە واسیتەی قوەتی حکومەتەوە تەسکین کراوە. "(ژیان، ژ ۱۳۸، ۱۹ ی تشرینی دوەمی ۱۹۲۸)

"لە لوڕستان

"ئێران بۆ لوڕستان عەسکەر سەوق ئەکات و تەحەشودات ئەکات بۆ ئەوەی تەئدیبی عەشایری لوڕ بکات کە ئەشقیایی ئەکەن و ئیتاعەتی ئەمری حکومەت ناکەن. "(ژیان، ژ ٨٤، ٤ ی تشرینی ئەوەلی ۱۹۲۷)

"شاهی ئێران

حەزرەتی شاهی ئێران بۆ تەفتیشی ئەو قوەتەی کە سەوق کراوە بۆ ئازربایئجان و کوردستان حەرەکەتی کردوە بۆ ئازربایئجان."(ژیان، ژ ٨٤، ٤ ی تشرینی ئەوەلی ١٩٢٧)

"جەلالەتی رەزا شاه زیارەتی ئازەربایئجان و کوردستان ئەکات

"تەهران، جەلالەتی رەزا شاه بە رێی هەمەدان دا تەشریف ئەباتە ولایەتی ئازربایئجان و مەنتیقەی کوردەواری و لە بەر وەفاتی عائیلەی وەزیری حەربیە کە خزمێتی جەلالەتی سەفەرەکەی تەئخیر بوە.

"ژیان، بەڵام وەکو حەوادیس دراوە جەلالەتی تەشریفی هێناوەتە ولایەتی تەبرێز و حەتا زیارەتی ساوجبولاق و سەقزیشی فەرموە."(ژیان، ژ ٢٠٨، ٣١ ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٩)

"ئیغتیشاش لە ئێرانا

"لەندەن، غەزەتەی دەیلی نیوز تەلغرافێکی نەشر کردوە کە لە موخبیری ئەستانبولیەوە وەرگرتوە ئەڵێ لە ئەکسەری شارە گەورەکانی ئێران دا لە خسوس تەتبیق و عەدەم قبولی تەجنیدی ئیجباریەوە ئیغتیشاش هەیە و با خسوس لە مەرکەزی ئازربایئجان دا کە تەبرێزە ئەم ئیغتیشاشە زۆر گەورە بو."(ژیان، ژ ١٣٦، ١٢ ی تشرینی دوەمی ١٩٢٨)

"ئێران لە موحەمەرە و ئەترافیا ئیدارەی عەسکەری ئیلغا کردوە

"تەهران، چونکە عەشیرەتەکانی ئەترافی موحەمەرە ئیستا بە تەواوی ئیتاعەتی حکومەت ئەکەن حکومەتی ئێران ئەو ئیدارە عەسکەریەی کە لەوێدا بو تەبدیلی کردوە."(ژیان، ژ ١٠٧، ٢٢ ی مارتی ١٩٢٨)

"ئینقیلابات له ئێران

"العراق: ئەو عەشائیرانەی کە لە شەرقی شیراز دانیشتون لە سەر بەعزێ تەکالیفاتی حکومەتی عیسیانیان کردوە و هەتاکو ئیستا لە تەرەف حکومەتەوە چەند دەفعە قوەی عەسکەریەیان نێرراوەتە سەر بەلام قابیل نەبوە تەئدیب بکرێن و ئیستاش حکومەت هەر خەریکی کۆکردنەوە و سەوقی قوەتە بۆ سەریان. وە لە سەر ئەم ئیغتیشاشاتە ئیدارەی شیراز و بوشەهر و خوزستان و لورستانی گۆڕیوە و کردویەتی بە ئیدارەیەکی عەسکەری.

"عەشائیرەکان گوتویانە بەم شەرائیتانەی لای خوارەوە ئەگەر حکومەت موساعەدە بکات ئیتر ئیتاعەت ئەکەین:

١. تەکالیفەکانیان کەم بکرێتەوە و بە واسیتەی مەئموری حکومەتەوە لێیان نەسێنرێ و رۆئەساکانیان مەجبور بن تەسلیمی حکومەتی بکەن.

٢. ئەو ئیدارە عەسکەریی‌یەی کە حکومەت تەشکیلی کردوە هەڵی گرێ.

٣. حکومەت واز لە مەسئەلەی سیلاح کۆکردنەوە بهێنێ.

٤. موکەلەفیەتی عەسکەریە لەغو بکاتەوە.

٥. ئەو قەرارەی کە لە بابەت لە بەر کردنی جل و کلاوی پەهلەوی‌یەوە داوێتی سەرفی نەزەری لێ بکات.

"لە سەر ئەمە قوماندانی عمومی ئەو ئەترافە پێی گوتون ئەم مەتالیبەی ئێوە عەرزی تەهران ئەکەم ئینتیزاری جواب بکەن. وە بە دزیشەوە قوەتێکی زۆری تری لە ئەترافیان کۆ کردۆتەوە. وە عەشائیرەکان کە ئەوەیان زانیوە حکومەت موتالەباتەکەیان قبوڵ ناکات و بە فێڵ مەحویان ئەکاتەوە دیسان هجومیان کردۆتە سەر قوەتەکەی حکومەت، ئەترافی قەزوین و هەمو خەتی تەلغرافیەی بەینی شیراز و بوشەهر و ئەو ئەترافەیان بڕیوە.

"حاسڵی لە ئەوەلی نیسانەوە ئەم هەرا و هوریایە دەوام ئەکات هێشتا حکومەت پێی تەسکین نەکراوە." ژیان، ژ ١٨٥، ١١ ی تەموزی ١٩٢٩)

"دیوانی عورفی له ئێرانا

"تەهران، بە موناسەبەتی بەعزێ ئیختیلالەوە حکومەتی ئێران مەجبور بوە لە چەند جێگایەک دا دیوانی عورفی تەئسیس بکا." ژیان، ژ ١٨٧، ٢٢ ی تەموزی ١٩٢٩

"هەراوهوریای ئێران

"بەغداد، قۆنسلۆسی ئێران لە بەصرەدا بەیانێکی نەشر کردوە و ئەڵێ: ئەوی الاوقات العراقی لە خسوس هەراوهوریای ناو ئێرانەوە نوسیویێتی ئەسلی نیە. حکومەت بە تەواوی هەمو عەشائیرەکانی مەغلوب کردوە و حەتا رەئیسی عەشائیری قەشقائیە، کە موئەسیسی هەراکە بون، بە بێ قەید و شەرت مەجبورەن تەسلیمی حکومەت بوە. وە مەسئەلەی ئیعدام کردنی پرنس فەیروز، وەزیری مالیەیش، ئەسڵ و ئەساسی نیە." ژیان، ژ ١٨٨، ٢٥ ی تەموزی ١٩٢٩

"هەراوهوریاکەی ئێران نەماوە

"پاریس، سەفارەتی ئێران لە پاریسا تەئیدی کردۆتەوە کە ئەو هەراوهوریایەی لە لایەنی عەشیرەتی قەشقائیەوە بەرامبەر بە حکومەتی ئێران ئەکرا نەماوە. حکومەت تەئدیبی کردون." ژیان، ژ ١٩٣، ٢٢ ی ئاغستۆسی ١٩٢٩

"قوەتی ئێران

"تەهران، حکومەتی ئێران قەراری داوە بۆ تەئمینی ئەمنیەت و ئاسایش دو فیرقە عەسکەر لە ئۆردوەکەی لە ساحیلەکانی جنوب، فیرقەیەک لە شیراز و، یەکێک لە ئەسفەهان دا، بە دائیمی دابنێ.

"دیوانی عورفی لە شیرازدا حوکمی ئیعدامی بە سەر ٥ رەئیس عەشیرەتەکانا داوە کە لە بابەت عیسیانەکەوە موتەهەم بون." ژیان، ژ ١٤٤، ٢٦ ی ئاغستۆسی ١٩٢٩

"وەزعیەتی ئێران

بەسرە، حکومەتی ئێران بە تەیارە بە ناو عەشائیرەکەدا بەیاننامەی نەشر کردوە و ئەڵێ ئەو عەشائیرانەی کە عیسیانیان کردوە ئەگەر لە زەرفی مانگێکا سیلاحەکانیان تەسلیمی حکومەت بکەن عەفو ئەکرێن.

"ئێران

"تەهران، عەساکیری ئێران لە ئەترافی موحەمەرە و حوێزەدا بە سەر عەشائیرەکانا موەفەق بون. وە زۆر لە رەئیس عەشائیرەکان تەسلیمی حکومەت بون. "ژیان، ژ ١٤٨، ٣ ی کانونی سانی ١٩٢٩)

"بەینی عیراق و ئێران

بەسرە، بەعزێ لە روئەسای عەشیرەتی (بنی طرف) کە موقابیل بە ئێران عیسیانیان کرد بو، ئیلتیجایان بە حکومەتی عیراق کردوە و حکومەتی عیراق سەعی ئەکات کە سیلاحیان لێ وەرگرێ. "ژیان، ژ ١٤٩، ٧ ی کانونی سانی ١٩٢٩)

تۆفیق سویدی، یەکەمین وەزیری مفەوەزی عیراق لە ئێران، لە (ص ٢٢١، "مذكراتي نصف قرن من تاريخ العراق والقضية العربية، دار الكاتب العربي، بيروت، الطبعة الاولى تموز ١٩٦٩.") ئەیگێڕێتەوە، عیراق پێشنیاری کردوە کە ئێران ڕێگە بدا بە عەرەبەکانی خوزستان بێن لە عیراق نیشتەجێ بکرێن و زەوی و زاریان بدرێتێ. بەڵام کەس لە ئێرانیەکان نەیوێراوە ئەم باسە لە گەڵ شادا بکاتەوە: سویدی نوسیوێتی: "عرض: وقد فكرت الحكومة العراقية في وقت ما بين ١٩٣٢ ١٩٣٤ ان تتفق مع ايران على السماح لهولاء بالنزول الى العراق اذا ارادوا حيث يمنحون اراضي في العراق يستغلونها، ويتمتعون بتقاليدهم ولغتهم وغير ذلك. ولكن تبين ان هذا الامر كان عسيرا جدا على الحكومة الايرانية ان تفاتح بشأنه الشاه! حتى انها ادعت انه ليس في امكان احد في ايران ان يكلم الشاه بهذا الخصوص. ص ٢٢١"

"هەرایەک لە بەینی عەسکەری ئێران و عەشائیری کوردا
"بەصرە، لە لای عەمارەوە لە حدودی عیراق و ئێرانا لە بەینی عەسکەری ئێران و عەشائیرێکی کوردا هەرایەکی خوێنین روی داوە. لە سەر ئەوەی عەشائیرەکە ویستویەتی بۆ لەوەڕ لە حدودی ئێران تێپەڕ بکات و قوماندانی محافەزەی حدود مەنعی کردون و بە قسەیان نەکردوە. لە سەر ئەوە لە کوردەکان ٤٧ کەس کوژراو و بریندار هەیە و لە عەسکەرەکانیش ١٨ کەس بریندار و کوژراو هەیە.
"ژیان: بۆ کوردەکان لازمە لە هەمو جێگایەک دا ئیتاعەتی ئەوامیری حکومەتی بکەن باخسوس لە گەڵ ئێرانا کە بە شەفەقەت معامەلەیان لە گەڵا ئەکات و نایێ مانیعی تەرەقی و تەعالیەی ئێران ببن."(ژیان، ژ ٢٣٨، ٨ ی مایسی ١٩٣٠)

## ٣. ٢. پێوەندی ئێران و وڵاتانی دنیا

"فرانسە و ئێران
"پاریس، مولحەقی عەسکەری فرانسز لە ئێران گەیشتۆتەوە پاریس لە خسوس ئێرانیەکانەوە قسەی ئەمەیە کە ئەمن و سکون لە ئێران دا جاریە. ئێرانیەکان ئارەزوی چاو لێ کردنی فرانسزەکان ئەکەن. ٤٠ زابیتی ئێرانی بەم نزیکانە ئەگاتە پاریس بۆ ئەمەی کە لە مەکاتیبی حەربیەی فرانسزدا علومی عەسکەریەیان ئیکمال بکەن. وەزیفەی ئەم زابیتانە لە پاش ئیکمالی تەحسیل تەنزیم کردنی ئۆردوی ئێران ئەبێت."(ژ ٢٤، ١٥ ی تەموزی ١٩٢٦)
"لە بەینی ئێران و روسیەدا
"لە بەینی وەزارەتی خاریجیەی ئێران و سەفارەتی روسیە لە تەهران دا دائیر بە ئیشوکاری تیجاری بەینی تەرەفەین مفاوەزات جاریە."(ژ ٣٧، ١٥ ی تشرینی ئەوەلی ١٩٢٦)

"له بەینی تورک و ئێرانا

"ئەنقەرە، عەلی خان فروغی وەزیری پێشوی حەربیەی ئێران مواسەلەتی ئەنقەرەی کردوە و لە خسوس مەسائیل و ئەو حادیساتەی کە لە حدودی بەینی یەکتریا واقیع بوە لە گەڵ حکومەتی تورکیادا موزاکەرە ئەکات."لژیان، ژ ٨٨، ١ ی تشرینی سانی ١٩٢٧)

"له بەینی روس و ئێرانا

"ئەو مفاوەزەیەی کە لە خسوس تەعینی حدودەوە جەرەیانی ئەکرد لە بەینی ئێران و روسیا ئەمجارە بە سەهلی تەواو بوە و بەم نزیکانە تەودیعی مەجلیسی مەبعوسان ئەکرێ."لژیان، ژ ٩١، ٢٢ ی تشرینی دوەمی ١٩٢٧)

"روسیە و ئێران

"تەهران، رۆژی ١ ی شوباتی ١٩٢٨ لە تەهرانا سورەتی موعاهەدەنامەکەی بەینی ئێران و روسیە تەبادول ئەکرێت و بەم موناسەبەتەوە وەزارەتی خاریجیەی ئێران ئێوارێ ئەو رۆژە دەعوەتێکی عمومی موەزەفینی سەفارەتی روسی کردوە."لژیان، ژ ١٠٢، ١٦ ی شوباتی ١٩٢٨)

"بەحرێن و ئێران

"جنێف، حکومەتی ئێران لە سەر موعاهەدەی بریتانیا و ئیبن ئەلسعود لە خسوس بەحرێنەوە لە جەمعیەتی عیسبەتول ئومەم دا پرۆتیستۆی حکومەتی بریتانیای کردوە."لژیان، ژ ٩٨، ١٧ ی کانونی سانی ١٩٢٨)

"قەراری مەجلیسی میللی ئێران موقابیل بە وەهابیەکان

"تەهران، ئەمرۆ مەجلیسی میللی ئێرانی ئەو قەرارەی کە موتەعەلیقە بە تەشکیلی هەیئەتێک لە ١٢ ئەعزا بۆ تەماشاکردنی مەسئەلەی تەجاوز و ئیعتیدای وەهابیەکان بە سەر حیجازدا وە ئەفعالی مونکەرە و غەیرمورزیەیان کە لە مەکەی موکەڕەمە و مەدینەی منەوەرەدا کردویانە تەسدیق کرد. وە ئەم هەیئەتە تەماشای موقەدەراتی حیجازیش ئەکات."لژ ٣٨، ٢١ ی تشرینی ئەوەلی ١٩٢٦)

"بەینی ئێران و حیجاز

"بەغداد، ئەو کۆمەڵی حیجازی‌یانە کە چوبون بۆ ئێران ئەو بەینەی کە لە وێدا ماونەتەوە فەوقەلعادە حورمەتیان گیراوە و بە شەرەفی ئەوانەوە لە تەهرانا زۆر کۆمەڵی رەسمی‌یان بۆ گیراوە. حکومەتی ئێران بە رەسمی ئیعتیرافی بە حیجاز کردوە. بەم موناسەبەتەوە مەلیکی حیجاز تەلغرافێکی تەبریکی نوسیوە بۆ مەلیکی ئێران و جەلالەتی رەزا شاهیش جوابی بۆ نوسیوەتەوە.

"رەئیسی کۆمەڵی حکومەتی حیجاز لە گەڵ وەزارەتی خاریجیەی ئێرانا موزاکەرەی کردوە کە ئەساسێک تەنزیم بکەن بۆ ئەوەی لە بەینی تەرەفەینا موعاهەدەیەکی لە سەر بکرێ."(ژیان، ژ ۱۹۷، ۱۲ ی ئەیلولی ۱۹۲۹)

"موعاهەدەی ئێران

"تەهران، موعاهەدەیەکی دۆستایەتی لە بەینی ئێران و ئیتالیادا کراوە.

"ئێران لە گەڵ بەلچیکایش دا عەینی موعاهەدەی کردوە."(ژیان، ژ ۱۹۷، ۱۲ ی ئەیلولی ۱۹۲۹)

## ٣. ٤. پێوەندی عیراق و ئێران

"لە خسوس ئیعتیرافی ئێران بە حکومەتی عیراق

"لەندەن، لە سەر سوئالێک کە لە مەجلیسی مەبعوسانی بریتانیادا لە میستەر ئۆستن چەمبەرلاین کراوە جوابی داوەتەوە ئەڵێ: حکومەتی بریتانیا تا ئیستا چەند دەفعە تەوسیەی حکومەتی ئێرانی کردوە کە ئیعتیراف بە عیراق بکات و ئەو مەنافیعەی کە حکومەتی ئێران لەم خسوسەوە چنگی ئەکەوێ بۆی بەیان کردوە، فەقەت هەتاکو ئیستا حکومەتی ئێران لەم خسوسەوە بێ موبالاتی نواندوە و گوێی نەداوەتێ."(ژیان، ژ ۱۱۶، ۷ ی حوزەیرانی ۱۹۲۸)

"وەزیری مفەوەزی ئێران

"بەغداد، غەفار خان وەزیری مفەوەزی ئێران مواصەلەتی بەغدادی کرد لە ڕێی میسرەوە وە زیارەتی جەلالەتی مەلیک فەیسەلی کرد و چەند دەفعە لە خسوس ئەو موشکیلاتانەی لە بەینی عیراق و ئێرانا واقیعە لە گەڵ وەزیری خاریجیەی عیراق دا موزاکەرەی کرد و لەم خسوسەوە تەقریری خۆی ئەدات بە وەزارەتی خاریجیەی ئێران و لە ٢٥ ی ٩ ی ٢٨ دا گەڕاوەتەوە بۆ تەهران." (ژیان، ژ ١٣١، ٤ ی تشرینی ئەوەلی ١٩٢٨)

"جەلالەتی مەلیکی عیراق تەبریکی ڕەزا شای کردوە

"بەغداد، بە موناسەبەتی تەتویجی شاهی ئێرانەوە جەلالەتی مەلیکی عیراق بە تەلغراف موبارەکبایی ڕەزا شاهی فەرموە.

"جەلالەتی ڕەزا شاهیش بە تەلغراف بەیانی تەشەکوری کردوە.

"ئیعتیرافی حکومەتی ئێران

"بەغداد، ڕەئیس ئەل وزەرای ئێران بە تەلغرافی ڕەسمی بە ناوی حکومەتی ئێرانەوە ئیعتیرافی بە حکومەتی عیراق کردوە." (ژیان، ژ ١٧٢، ٦ ی مایسی ١٩٢٩)

"داخلی

وەفدی عیراقی ئێران

بەغداد، ئەو وەفدەی کە لە لایەنی عیراقەوە چوبون بۆ ئێران ڕۆژی ١ ی مانگ گەڕانەوە و زۆر بەیانی مەمنونیەتیان کردوە کە لە هەمو جێگایەک بە حورمەتەوە ئیستیقبال کراون." (ژیان، ژ ١٧٣، ٩ ی مایسی ١٩٢٩)

"ڕەئیسی کۆمەڵی عیراق

"بەغداد، کۆمەڵی عیراق کە لە ڕیاسەتی ڕۆستەم بەگ ئەل حەیدەریدا چوبون بۆ تەهران عەودەتیان کردۆتەوە و ئەو کاغەزەی کە لە جەلالەتی مەلیکی عیراقەوە برد بویان بۆ ڕەزا شاه بە ئیحتیرامەوە قبوڵی فەرموە.

"لـه جوابـا كاغـەزێكى موفەسـەلتر كـە هـەموى بـەيانى مـوەدەت و دۆستايەتى بەين ئەكات لە تەرەف جەلالەتى رەزا شاهى ئێرانەوە نوسراوە بۆ مـەليكى عـيراق و تەسـليمى كۆمەڵەكـەى عـيراق كـراوە."لژيـان، ژ ١٧٤، ١٣ ى مايسى ١٩٢٩)

"موعاهەدەى ئێران و عيراق

"تەهران، غەزەتەى تەرەقى لە ئێرانا نوسيوێتى كە ئەو موعاهەدەيەى لە بەينى ئێران و عيراقا لە بەغداد لـە تـەرەف مومەسيلى ئـێران سـەميعى خانەوە... لە جياتى ئێران موديرى عمومى شاه ئيمزاى ئەكات."لژيان، ژ ١٨٤، ٨ ى تەموزى ١٩٢٩)

"سەميعى خان

"بەغداد، سەميعى خان كە بوە بە وەزيرى مفەوەزى ئێران بۆ عيراق رۆژى ١٧ ى مـانگ مواسـەلەتى بـەغدادى كـردوە و، لـە حـدودا لـە تـەرەف حكومـەتى عيراقـەوە واغۆنێكـى خسوسـى لـە شـەمەندوفەرەكەدا بـۆ حـازر كراوە."لژيان، ١٨٧، ٢٢ ى تەموزى ١٩٢٩)

"بەينى عيراق و ئێران

"سەميعى خانى وەزيرى مفەوەزى ئێران كە ئـەمجارە تـەعين كـراوە بۆ ئـەوەى لە گـەڵ حكومەتى عيراقا ئيتيفـاق و تەئسيسـى عـەلاقاتى بـەين بكـات گەيشتۆتە بەغداد و رۆژى ٢٠ ى ئەم مانگە لە گەڵ وەزارەتى خاريجيەى عيراقا دەستيان كردوە بە موزاكەرە."لژيان، ژ ١٨٨، ٢٥ ى تەموزى ١٩٢٩)

"حكومەتى ئێران و عيراق

"بەغداد، لـە دواى تـەواوبونى موعاهەدەكـەى بـەينى ئـێران و عـيراق حكومەت فكرى هەيە غەيرى سەفيرى عمومى قۆنسلۆسى تريش بنێرێ بۆ بەندەرەكانى ئێران، كرمانشاه، هەمەدان و سائيرە.

ئێرانیش فەرى هەیە لە موصل، کەرکوک، ئەربیل و سلێمانی دا قۆنسلۆسخانە تەشکیل و قۆنسلۆسی بۆ بنێرێ."لژیان، ژ ۱۹۳، ۲۲ ی ئاغستۆسی ۱۹۲۹)

"موعاهەدەی عیراق و ئێران

"بەغداد، حکومەتی ئێران و عیراق موعاهەدەیەکیان کردوه و لە دوای تەواوکردنی و موافەقەتی تەرەفەین لە تەرەف رەئیس ئەل وزەرای عیراقەوە حەفلەیەکی بۆ کراوە و لە حالێکا وەزیرەکان و هەمو ریجالی سیاسیەی عیراق لە حەفلەکەدا حازر بون لە تەرەف سەمیعی خان وەزیری مفەوەزی ئێران و رەئیس ئەل وزەرا و وەزیری خاریجیەوە ئیمزا کراوە.

"ئەم موعاهەدەیە عیبارەتە لە چەند مادەیەک لە بابەت ناردنی سوفەراوە بۆ ئەرازی یەکتری و موافیقی قەوانینی بەینەلدوەل موحافەزەی حقوقی سەفیرەکان و لە بابەت ئیخراجات و ئیدخالاتی تیجارەت لە بەینا، ئەویش موافیقی قەوانینی دوەلی و بە سەربەستی دانیشتنی ئەهالی ئێران لە عیراقا و هی عیراق لە ئێرانا.

"ئەم موعاهەدەیە جاریٚ بۆ ساڵێک کراوە لە دوای تەواوبونی ئەمە لە بەینی هەردولادا مەعاهەدەیەکی واسیعتر ئەکرێتەوە."لژیان،ژ ۱۹٤، ۲٦ ی ئاغستۆسی ۱۹۲۹)

"تەلغرافی موبارەکبایی جەلالەتی شاهی ئێران

بە موناسەبەتی تەتویجی جەلالەتی مەلیکی عیراقەوە جەلالەتی رەزا شاهی ئێران تەلغرافێکی موبارەکبایی نوسیوە بۆ مەلیکی عیراق و جەلالەتیشی جوابی نوسیوەتەوە وە بەیانی مەمنونیەتی فەرموە."لژیان، ژ ۱۹۵، ۲ ی ئەیلولی ۱۹۲۹)

"ئەسرەتولاخانی بەهنام

"بەغداد، جەنابی میرزا نەسرەتولاخانی بەهنام لە دمرەجەی ئەوەل دا بوە بە سکرتێری قۆنسلۆسخانەی ئێران لە عیراق. وە وەزیفەی قۆنسلۆسیش ئەبینێ لە بەغداد." (ژیان، ژ ٢٠، ٢٦ ی ئەیلولی ١٩٢٩)

"ئێران

"تەهران، حکومەتی عیراق خەریکە فەخامەتی تۆفیق بەگی سویدی بکات بە وەزیری مفەوەزی ئێران و عەبدولرەسول چەلەبی موفەتیشی مالیەش بێ بە سکرتێری و ئینتیزار ئەکرێ بەم زوانە تەشریف بێنێتە تەهران و ئەڵێن حکومەتی عیراق عەتا ئەمین بەگ سکرتێری مفەوەزیەتی عیراق لە لەندەن تەرفیعەن ئەیکات بە سەفیری موحەمەرە." (ژیان، ژ ٢٠٨، ٣١ ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٩)

"سەفارەتخانەی ئێران و عیراق

"بەغداد، حکومەتی عیراق و ئێران خەریکی موزاکەرەن بۆ ئەوەی موبادەلەتەن ئەرازی بدەن بە یەکتری کە قۆنسلۆسخانەی تیا دروست بکەن." (ژیان، ژ ٢٣٣، ٣ ی نیسانی ١٩٣٠)

## ٣ . ٥. کۆنسۆلگەی ئێرانی لە سلێمانی

سلێمانی هاوسنورە لە گەڵ ئێران و، پێوەندی کۆمەڵایەتی، بازرگانی، ئابوری، فەرهەنگی لە نێوان سلێمانی و شارە کوردنشینەکانی ئێران دا هەمیشە بە هێز بوە و، هاتوچۆیان لە بەین دا بوە. دوای دامەزراندنی پێوەندی دیپلۆماسی لە نێوان هەردو دەوڵەتی عیراق و ئێران دا، جگە لەوەی لە تاران و بەغداد سەفارەتی هەردو وڵات کراوەتەوە، بۆ کارئاسانی

هاوولاتی‌یان جگە لە پایتەخت لە چەند شارێکی کەدا کۆنسوڵگە، یان وەکو لە سلێمانی پێیان وتوە (شابەندەرخانە) یان کردوّتەوە. یەکێک لەو شابەندەرخانانە لە سلێمانی بوە. لە سلێمانی ژمارەیەک هاوولاتی ئێرانی، کە هەڵگری ناسنامەی ئێرانی بون، بە شێوەیەکی قانونی (ئیقامە) یان هەبوە، کارو کاسبی‌یان کردوە. هەندێکیان دوکاندار و هەندێکیان پیشەکار بون.

ژیان هەواڵی کردنەوەی ئەم کۆنسوڵگەیەی بەمجۆرە راگەیاندوە:

"قۆنسلۆسی ئێران

"جەنابی قۆنسلۆسی ئێران کە تازە لە تەرەف حکومەتەکەیەوە تەعین بوە بۆ لیوای کەرکوک و سلێمانی چەند رۆژێک لەمەوپێش تەشریفی هێناوەتە سلێمانی عەرزی بە خێر هاتنی ئەکەین."(ژیان، ژ ٢٢٩، ٢٧ ی شوباتی ١٩٣٠)

کۆنسوڵگەی ئێران لە سلێمانی جگە لەوەی کاروباری هاوولاتی‌یانی خۆی رایی کردوە، هەندیٚ چالاکی نواندوە. ژیان بەم بۆنەیەوە ریپۆرتاجی لە سەر نوسیون. بە بۆنەی (رۆژی تاجگوزاری شاهی ئێران) ەوە نوسیویێتی:

"لە غەزەتەی پێشومانا نوسی بومان کە بە موناسەبەتی رۆژی تاجگوزاری ئەعلا حەزرەت ئەقدەس شاهی ئێران رەزا شاهی پەهلەوی‌یەوە، نائیبی قۆنسلۆسی دەوڵەتی عەلیەی ئێران لە سلێمانی بە شەرەفی ئەو رۆژە مەسعودەوە کە تەسادوفی رۆژی پێنجشەمەی کرد لە قۆنسلۆسخانەدا ئیحتیفالێکی ئیجرا فەرمو.

"بۆ ئیجراکردنی ئەم ئیحتیفالە چەند رۆژێک لەمەوپێش لە قۆنسلۆسخانەدا تەرتیباتی لازیمە ئیجرا و بە تەزکەرەی مەتبوع مەدعویین دەعوەت کرا بون. ئەو رۆژە قۆنسلۆسخانە بە حەوش و دیوار و ئەترافیەوە بە بەیداخی پڕ هەیبەتی دەوڵەتی عەلیەی ئێران و بە سوجادەی نایابی جوان

جوان و به ئەنواعی گوڵ رازا بووەوە و بە چرای ئەلەکتریک تەنویر کرا بو. وە بۆ ئیستراحەتی میوانەکان هەمو ئەسبابێک تەهیە کرا بو.

"ئەو رۆژە لە بەیانیەوە هەتاکو سەعات ۳ ی شەو میوانەکان تاقم بە تاقم هەر کۆمەڵێک لە میعادێک دا کە بۆی دانرا بو تەشریف و زیارەتی قۆنسلۆسخانەیان کرد و هەر کەسە بە جیا بەرامبەر بەم رۆژە موبارەکە بەیانی مەسۆوریەتی کرد و لە تەرەف ئاقای قۆنسلۆس و مەئمورینی مەعیەتیەوە فەوقەلعادە ئیکرام و حورمەتی میوانەکان ئەفەرمورا.

"ئەعلا حەزرەت ئەقدەس شاهی ئێران کە لەم رۆژەدا لە هەمو ئەنحای ئێران و لە قۆنسلۆسخانەکانی خاریجیەیان دا ئەم ئیحتیفالەی بۆ ئەکرێ، ئەگەر لەمەیش سەدقات زیاتر بۆی بکرێ هێشتا هەر کەمە. چونکە هەمو ئەیزانین حکومەتی عەلیەی ئێران کە حکومەتێکی قەدیمی ساحیب تاریخ و عەنعەناتە و کە لە دنیادا بە حکومەتێکی مەشهور ئەناسرێ مودەتێکی زۆر بە سەبەبی بێ موبالاتی حوکمدارە پێشوەکەیانەوە ئینتیزامی حکومەتەکەی تێک چوبو و ئینقیلاباتی داخلیە زوربەیەکی زلی لێ دابو بە نەوعێک کە خەریک بو عادەتەن قەدر و قیمەتی نەمێنێ. بەڵام حەزرەتی ئەقدەس رەزا شاهی پەهلەوی کە لەو وەقتەدا لە ئیدارەی عەسکەریەدا بو وە کە لە ئێران دا نفوزێکی فەوقەلعادەی هەبو بۆ رەفعی ئەم حالە تەشەبوسی فەرمو و کە زانی ئەگەر ئێران لەم حالەدا بمێنێتەوە مەحو ئەبێتەوە بە هەمو قوەتیەوە بۆ زیندوکردنەوەی حکومەتەکەی هیمەتی فەرمو.

"موشار ئیلەیهی چونکە زاتێکی میلەتپەروەر و دیموقراتیە و بەم سەبەبەوە موحیبەتێکی شەخسی لە دڵی میلەتەکەدا هەیە بە سەبەبی معاوەنەتی پیاوە عاقل و گەورەکانی ئێرانەوە و بە واسیتەی ئیقتیدارێکی فەوقەلعادە و دەهایەکی خاریقەی.......... نەجات دا و تەرەقی و تەعالیەکی دا بەم حکومەتە بە نەوعێک کە ئەمرۆ لە ئەنحای ئەم دەوڵەتەدا ئینتیزامێکی

باش لە ئیدارەیدا و لە هەمو خسوسێکەوە رێکوپێکیەکی باشی تیایە، لە خاریجیشەوە بە حکومەتێکی زیسەتومت ئەناسرێ و بەم نەوعە قیمەتی پەیدا کردوە. ئەم جیهادەی کە ئەعلا حەزرەت رەزا شاه ئیجرای فەرموە وەنیە هەر ئێران بەوە مەنفعەتی بوبێ، ئەم حکومەتە لە بەر ئەوەی لە شەرقایە و باخسوس حکومەتێکی ئیسلامیە حەرەکەتەکەی بە عمومی بۆ شەرق و بە تایبەتی بۆ ئیسلامیەتیش نەفعێکی فەوقەلعادەی هەبو وە روی میلەلی شەرق و ئیسلامی سپی کرد.

"ئینجا لە بەر ئەوە تەبیعی بە موناسەبەتی ئەم رۆژی تاجگوزاریەوە وەکو میلەتی ئێران هەمو ئیسلامێک تەشریکی مەسعودیەتی میلەتی نەجیبەی ئێران ئەکات و تەمەنای مەسعودیەت و ئیقبالی ئەم حوکمدارە عالی و عادلە ئەکا.

"ئومێد ئەکەین ئەم حکومەتە ئیسلام و دراوسێیەمان هەتا ئاخری رۆژ بە رۆژ زیاتر و خێراتر بۆ عالەمی مەدەنیەت هەنگاو بهاوێ و بە سەبەبی ئەم حوکمدارەیانەوە مەسعود و موەفەق بێ."(ژیان، ژ ٢٣٧، ٢٨ ی نیسانی ١٩٣٠)

ئەم وتارە جگە لە گێڕانەوەی هەواڵی ئیحتیفالەکە بە خۆڕایی ستایشێکی زۆر و ناڕاستی شای ئێرانی کردوە، بە میلەتپەروەر و دیموقراتی ناوی بردوە، لە کاتێک دا زوڵم و زۆری رەزا شا و کوشتنی نەیار و ناحەزەکانی شتێکی ئاشکرایە و، چەوساندنەوە و ئازاردانی کورد و، گرتن و راونانی سەرانی کورد لە ئێران دا یەکێ بوە لە کارەکانی رەزا شا. هەر لەو ماوەیەدا سمکۆ بە فێڵ راکێشرایە ناو داوی مردنەوە لە شنۆ کوشتیان و، دەیان گەورەپیاوی کورد رەوانەی شوێنە دورەکانی ئێران کران و، ساڵانی دورودرێژ بە بێ سوچ و تاوان لە زیندان و دەسبەسەریدا گل درانەوە. ژیان خۆی هەواڵی هەندێ لەم روداوانەی نوسیوە.

"حادیسەی ئێران و جەعفەر سوڵتان

"لە تەرەف حکومەتی عەلیەی ئێرانەوە تەلەبی ئەسلیحە لە جەعفەر سوڵتان کرا. جەعفەر سوڵتان موافەقەتی ئەم تەلەبەی نەکرد لە بەر ئەمە حکومەتی عەلیەی ئێران عەسکەرێکی زۆری سەوق کردە سەر جەعفەر سوڵتان موقابەلە و موسادەمەیان بو و، جەعفەر سوڵتان ئەمڕۆ بە شیدەت لە تەحتی تەزیق و موحاسەرەدایە. وە بۆ ئەمەی کە لە حدودی عیراق دا ئیختیفا نەکا لە تەرەف جەیشەوە دە سریە عەسکەر سەوقی حدودی ئێران کراوە."لژیان، ژ ۳۰۵، ٢٤ ی کانونی ئەوەلی ۱۹۳۱

"بۆ زانینی هەمو

"لەم بەینەدا کە بە موناسەبەتی مەسائیلی حدودی هەورامانەوە و بە حەسەبی ئیقتیزای سیاسەت و مەوەدەتی بەینی دەوڵەتی عیراق و ئێران حکومەت ئەمری کردوە بە ئیعادەی مولتەجی‌یەکانی هەورامان بۆ ئێران و، ئەوانەی کە عەودەت ناکەنەوە ئیبعادیان بۆ مەسافەیەکی دور لە حدود. موحتەمەلە کە لەم مەسائیلە بەعزێ رەعایای دەوڵەتی ئێران وا حاڵی بن کە حکومەتی عیراق دەرحەق بە عومیان وا معامەلە ئەکات وە یا تەزیقیان ئەکات.

"لازمە رەعایای دەوڵەتی ئێران باش حاڵی بن کە ئەم مەسئەلەیە تەنها دەرحەق بە مولتەجی‌یەکانی ئێران تەتبیق ئەکرێ و، دەخل و عەلاقەیەکی نیە بە سەر رەعایای سائیرەی ئێران دا کە بە حەسەبی تیجارەت و سنعەت و حیرەفیانەوە لەم لیوایەدان و حکومەت بە چ نەزەرێکی عادلانە و موشفیقانە تەماشای رەعایای خۆی ئەکات هەر بە عەینی نەزەر تەماشای ئەوانیش ئەکات.

"شایەد لە بەدخواهانی حکومەت و میلەت کەسێ تەشویق و تەرغیبی رەعایای حکومەتی ئێران بکات بۆ تەرکی تابیعەتی ئێران و تەجەنوس بە

بنسیەتی عیراق وە یا ئیخافە و تەهدید وە یا بە سورەتیٚ کە موجیبی تەشویشی فکر و نارەحەتی خۆیان بیٚ، لازمە فەورمن کەیفیەت بە ئیدارە ئیخبار بکریٚ و ئیدارەی حازرە کە بە موجیبی قانون ئەو کەسە بەدخواهە ئوسولەن تەجزیە بکات.

"بینائەن عەلەیهی غەیر ئەز مولتەجیەکان کە معامەلەیەکی خاسیان دەرحەق ئیجرا ئەکریٚ عمومی رەعایای دەوڵەتی ئیٚران لە دائیرەی حدودی قانون دا سەبەست و مەسونن. موتەسەرِیفی لیوای سلیٚمانی"(ژیان، ژ ٣١٤، ١٠ ی مارتی ١٩٣٢)

"رۆژی ولادەتی ئیمپراتۆری دەوڵەتی عەلیەی ئیٚران جەلالەتی رەزا شاه

"رۆژی ١٤ ی مارتی ٩٣٢ کە موسادیفی سیٚشەمو بو، موسادیفی رۆژی ولادەتی ئیمپراتۆری ئیٚران رەزا شاهی کرد. بۆ ئەو رۆژە لە تەرەف جەنابی قۆنسلۆسی ئیٚران میرزا عەبدولفازیل خانەوە عمومی ئەرکان و موستەخدەمینی مولکیە و ئومەرا و زابیتانی عەسکەریە و سادات و عولەما و ئەشراف و موتەحەیزانی مەملەکەت بۆ رەسمی ئیحتیفالی ئەم رۆژە بە تەزکەرەی دەعوەتیە دەعوەت کرا بون. موافیقی پرۆغرامی مەراسیمی ئەم دەعوەتە لە ساعەت یەک و نیوی عەرەبیەوە هەتا پانزەونیوی عەرەبی ئەم زەواتە تاقم تاقم ئیجابەتی ئەم دەعوەتەیان کردو زۆر بە ئیحتیرام تەسعید و تەبریکی ئەم رۆژەیان کرد و جەنابی قۆنسلۆس بە قابیلیەتی نەجیبانە ئیعزاز و ئیحتیرامی مەدعویونی بە جیٚ هیٚنا.

"شەکرلەمە و چای و بیسکویت و جگەرە و قەهوە تاقم بە تاقم تەوزیع کرا. ئەو رۆژە دائیرەی قۆنسلۆسخانە زۆر جوان و مونتەزەم و موعەزەم رازا بووەوە. ساعەت قەریب دوانزە نیهایەتی مەراسیم هات. بۆ شەویش قۆنسلۆسخانە بە ئەلەکتریک تەنویر کرابو."(ژیان، ژ ٣١٦، ٢٤ ی مارتی ١٩٣٢)

## ٣. ٦. هەواڵی جۆراوجۆر

"وەزیری داخلیەی ئێران

"تەهران، وەزیری داخلیەی ئێران حەرەکەتی کردوە بۆ قەسری شیرین بۆ ئەوەی تەماشای وەزعیەتی عومومی حدودەکە بکات و چاویشی بەو بینا گەورەیە بکەوێ کە بۆ خەستەخانە دروستی ئەکەن."ژیان، ژ ١٣٢، ٢٥ ی تشرینی ئەوەڵی ١٩٢٨)

"ئیختیراعی ئێرانیەک

"تەهران، وەزارەتی مەعاریفی ئێران لە سەفیری ئێران لە واشینتۆنەوە تەلغرافێکی وەرگرتوە ئەڵێ لە تەبەعەی ئێران ئەحمەد خان کە لە مەکتەبی هەندەسەدا ئەخوێنێ و لە فابریقەی فۆردا ئیش ئەکات ئەمجارە ئیختیراعێکی موهیمی کردوە لە بەر ئەوە زۆر موهیم بوە لە ئامریقادا بە ئیسمی خۆیەوە.. کراوە. ئیختیراعەکەی ئەمەیە: کە ئوتومبیلێکی دروست کردوە چوارسەد کەس ئەگرێ و بە ساعەتێ سیرعەت ئەتوانێ بە سەر هەمو شاخێکی بەرزا هەڵبکەرێ."ژیان، ژ ١٣٦، ١٢ ی تشرینی دوەمی ١٩٢٨)

"ئەحوالی ئێران     ئینتیخاباتی ژن

"تەهران هەتا ئیستا زۆر لائیحە تەودیعی مەجلیسی وزەرای ئێران کراوە بۆ ئەوەی ئەو ژنانەی کە عومریان گەیشتۆتە ٢١ساڵ و لە مەکاتیبی ئیبتیدائیدا تەحسیلیان تەواو کردوە لە ئینتیخاباتا رەئییان ببێ."ژیان، ژ ١٣٨، ١٩ ی تشرینی دوەمی ١٩٢٨)

"ئێرانیەکان لە بەحرا داوای رێی تیجارەت ئەکەن

"بەغداد، ئێران ئەڵێ مادامکە لە عیسبەتول ئومەم دا ئەعزام لازمە لە بەحرا مەنفەزێکم بدەنێ کە بتوانم لە ساحیلی سوریەوە واپۆرم بچێ بۆ بەحری سفید چونکە ئەم رێگایە چاکتر نزیکم ئەکاتەوە بۆ غەربی ئەوروپا."ژیان، ژ ١٣٩، ٢٢ ی تشرینی دوەمی ١٩٢٨)

"تەهران، بۆلشەویکەکان لە تەهرانا مەکتەبێکیان کردۆتەوە کە موعەلیمەکان بە واسیتەی ئەم مەکتەبەوە پرۆپاغاندەی بۆلشەویکێتی ئەکەن.

"تەهران، رەزا خان قەراری داوە بە هەمو قوەتیەوە تەشەبوس و سەعی بکات کە هیچ وەختێک ئامالی بۆلشەویکی لە ئێرانا بلاو نەبێتەوە و حەتا بۆ ئەم مەسئەلەیە قوەتێکی ٥ هەزار کەسیی بۆ ئازربایجان سەوق کردوە.

"تەهران، حکومەتی ئێران ئیقتیراحێکی موقابیل بە مەجلیسی میلی نوانوە کە بۆ ئیشوکاری مالیەی ئێران لە خاریج شەش حەوت کەس ئیستیخدام بکات.

"تەهران، حکومەتی ئێران شەش موەزەفی وەزارەتی حەربیەی حەبس کردوە و لەمانە بەعزێکیان عەسکەرین و بەعزێکیان مولکین، ئەسبابی حەبس کردنەکەیان مەجهولە."ژیان، ژ ٨٦، ١٨ ی تشرینی ئەوەلی ١٩٢٧)

"ئەلێن حکومەتی ئێران رێی بەینی حەیدەرئاباد - جەلدیان کە ٦ ساعەت لە حدودی عیراقەوە دورە چاکی کردوە و بە تەواوی ئوتومبیلی پیا ئەڕوا و، لە سەردەشتیش قشڵەیەکی بۆ عەسکەری دروست کردوە."ژیان، ژ ٩١، ٢٢ ی تشرینی دوەمی ١٩٢٧)

"تەیارە لە سەر دەماوەند

"تەهران، شیرکەتی تەیەران (جنکرس) ی ئەڵمان لە تەهران دەستی کردوە بە گەڕان بە سەر هەرە نوقتەی بەرزی شاخی دەماوەندا و، لە ئەهالیش ئەوی ئەیەوێ ئەم سەیرە بکات بە ١٥ تومان سواری ئەکەن."ژیان، ژ ٩١، ٢٢ ی تشرینی دوەمی ١٩٢٧)

"فەقیرەکانی ئێرانی لە بەغداد

"حکومەتی ئێران ئەمری داوە بە مەئمورینی پەساپۆرتی بەغداد کە لەمەودوا بۆ ئەو ئێرانیە فەقیرانەی کە لە بەغداوە عەودەت ئەکەنەوە بۆ ئێران مەجانەن پەساپۆرتیان بدەنێ."ژیان، ژ ٩٩، ٢٤ ی کانونی سانی ١٩٢٨)

"وەلی عەهدی تازەی ئێران

